دەستەی راویژکاران
حسین عارف
رەووف بیگەرد
ریبین ئەحمەد هەردی
سەرپەرشتی گشتی
شیرکۆ بیکەس
بەریوەبەری رۆڤار
دلشاد عەبدوڵڵ
کارگیر
عـــوسمان شـــەیدا
سەپەرشتیاری هونەری
قادر میر خان
مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سعید
8
2000/10/1



ڕێبوار سەعید

-ساڵی 1962 لە سلێمانی لەدایك بووە.

-1997 كۆلیجی هونەری لە لەندەن تەواو كردووە

-1999 بڕوانامەی ماستەری لە هونەردا هێناوە.

-1999 خەڵاتی باشترین پڕۆژەی هونەری(سۆدیی گرافیكی لە لەندەن و زانكۆی مدل سیكس) وەرگرتووە.

((ژمارەیەك پێشانگای تایبەت و هاوبەشی لە زۆربەی وڵاتانی دەرەوەو ناوەوەی وڵات كردۆتەوە))

## ڕێگا

شێركۆ بێكەس

ڕۆژێ زەمین بوركانی بوو
بوركانیش كوردستانی بوو
كوردستانیش كوڕی وەكوو:
"ئارارات"ی لێ كەوتەوە.
ئاراراتیش كوردی لێ بوو
كوردیش دووانەی
چەوسانەوەو تێكۆشانی
بەیەک سک بوو
لەو دوانەیەش
ڕێگای وەكوو
"یەڵماز گۆنا"ی لەدایک بوو

1985



(ڕۆڤار) بڵاوكراوەیەكی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك دەری دەكات
ناونیشان
سلێمانی -فولكەی یەكگرتن -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ ڕۆڤار
ت / 29609-29839
لەدەرەوەی كوردستان
Tel: 0044162846008 Fax: 00441628477660
چاپخانە : دەزگای سەردەم

# * تۆبیۆگرافیایەکی کورتی یەڵماز گۆنای

**بەقەڵەمی یەڵماز گۆنای**

من لەناوچەیەکی لادێییدا چاوم بەدنیا پشکوتووە، بنەماڵەکەم جوتیارو هەژاری بەستەزمان بوون ولەهەمان کات دا کوردیش بوون. بۆیە ئایدۆلۆژیای من لەیەك ئایدۆلۆژیای جوتیاری کە بەئەنقەستو بەپێویست بورژوایە، سەرچاوەی گرتووە.

غایەتێکی لەدایك بوونوو و ژیانم لەنێو کەشاوەرزانی فەقیرو بەتایبەت پەیوەندیم بە میللەتێکی زوڵم لێ کراو، کە میللەتی کوردبێ، شوێنەواری لەسەر بیرو هۆشم دانا، وە ئەو شوێنەوارە منی بۆلای لێکۆڵینەوەی چڕو پڕ لەشتەکان ڕاکێشا، بەڵام نەم دەزانی چ شتێك. تا ئەو جێیەی نەم دەزانی ناوی ئەو شتە چیە، غایەتێکی کە هەر بەشوێنی دا وێڵ بووم.

لەسەرەتاکانی دەهەی 50دا چاوم بەچەند کەسایەتێك کەوت، بۆ نموونە شیعرەکانی (نازم حیکمەت) کە بۆ شەڕی ناوخۆیی ئیسپانیا هۆنیبوویەوەخوێندوە لەساڵی 1953 دەستگیری بەربڵاوی کۆمۆنیستەکان لەتورکیا هاتە پێش، لەنێوانیان دا هێندێك شاعیر بوون شیعریانم خوێندەوە. ئەو پێشهاتانە هیچ کامیان قانوونی نەبوون.

بەواقیع سۆسیالیزمی عیلمی نەبوو. زۆرتر ئایدیالیستی بوو، جۆرێك لە یەتوپیا. کەس شتێکی لەبارەی چینی کرێکارەوە باس نەدەکرد، هیچ کەس لەبارەی مارکسیزم–لینینیزم قسەیەکی نەدەگوت. لەبارەی ماتریالیسمی دیالێکتیش هەروەها شتێك باس نەدەکرا.

تەنیا جۆرێ لە ئەدەبیات بوو کە لەبارەی چارە ڕەشی، فەقیریو پێویستی ئاڵو گوڕ هێنان بەسەر ئەو ژیانەدا ئەدوا. بەڵام ئەوان ڕوونیان نەکردەوە لەگەڵ کێ شەڕبکەین، چۆن



شەڕ بکەین، ئەشێ لەگەڵ چ فیکرو بۆچوونێك بەشەڕبێین، هیچ کامیان لەوانە نەبوون. لەژێرسایەو تەئسیری ئەم بارودۆخەدا بوو، دەستم کرد بەنووسینی کورتە چیرۆكو دەستم کرد بەقسە کردن، هەر بەو هۆیانەبوو کە بۆهەوەڵین کەڕەت لەگەڵ پۆلیس دەستەو یەخە بووم.

لە ساڵی 1955 بەخاتری نووسینی کورتە چیرۆکێك (کەهێشتا ئەوکاتە لە قوتابخانەبووم)، بەتاوانی تەبلیغی کۆمۆنیستی ڕەوانەی دادگایان کردم.

کە ئەمە چیرۆکێکی کورت بوو، تژی لە هەستو ئیحساس، بەدوای محاکەمەیەکی دریژخایەن لە ساڵی 1961 بۆ ماوەی دووساڵو نیو زیندانیو فەرمانی دورخستەوەیان بەسەردادام.

بەڵام لەکاتی محاکەمە کردنم لە ساڵی 1957 ناچاربووم، ئادانا، شارەکەم ئەو شوێنەی کە دەورانی لاوێتیم تێدا بەسەر بردبوو لەوێ خوێندبووم جێ بێڵموو بچمە ستانبوڵ بۆ پەیوەندی لەگەڵ حیزبی کۆمنیست.

بەپێچەوانەوە بەواقیع نەمدەزانی کۆمۆنیست چیە، بەڵام خەڵکی منیان بەکۆمۆنیست دەناسی، چوومە ستانبوڵ، فریوم خوارد. لەگەڵ هەر کۆمۆنیستێکی دادەنیشتم بێ هیوای دەکردم، ئەو کاتە نەم دەزانی چۆن ڕوونی کەمەوە ، چ نێوێك لەسەر ئەو فریوە دانێم.

ساڵی 1973 کە بۆ جاری دووەم خستمیانەوە زیندان دەستم کرد بەخوێندنەوە تازە ئەوکاتە بوو کەتوانیم نێوێك لەسەر ئەو فریوکاریە دانێم.

تێ گەیشتم کە فریوی ڕویزیونیسمم خوارد بوو. بەڵام ئەوکات مارکسیزمو لینینیزمم نەدەناسی، مەبەستم ئەوەنیە کە ئێستا بەتەواوی دەی زانم، بەڵام دەستم کرد بەخوێندنەوەیان. لەماوەی نێوان ساڵەکانی 61و63دا لەزیندانو تاراوگە ژیانم بەسەر بردو دووایی لەساڵی 1963دەورەو فازێکی نوێ لە ژیانمدا دەستی پێ کرد، لەساڵی 63وەك (caracter) کاراکترێك دەستم بەکارکرد، لەزینداندا بووم کە فیکری کاراکتری لە کەللەی دام، کە ببمە بەنێو بانگترین کاراکتری دنیا، بتوانم تەواوی مەبەستوو توانایەکانم بخەمە گەڕ.

بۆیە حیسابی هەموو شتێکم لێك دایەوە؛ هەموو تاکتیکەکانم لە زیندان تەواو تاقی کردەوە، وەکاتێك لە زیندان هاتمە دەرێ دانە دانەیانم پراکتیزە کرد بۆیە ساڵی 1965 بوومە یەکێك لەهەرە هونەرمەندە خۆشەویستوو بەنێو بانگەکان.

ناتوانم بڵێم تەواوی ئەو فیلمانەی کارم تێدا کردبوون فیلمی شۆڕگێڕی یان دیموکراتیك بوون بەڵام هەموویان لەنێو دڵی خەڵکی دا خۆشەویست بوون. فیلمەکانم دەنگ

دانەوەی هەستو ئیحساسو ڕەنجو مەینەتیەکانی خەڵکی بوون.

هەندێکیان دەتوانین بڵێین کە هەڵەی سیاسیو ئایدۆلۆژیان پێوە دیاربوون.

تاقمێکیان ریفۆرمیست(چاك سان) بوون، دەتوانین بڵێین برێکیان ئانارشیستی بوون، هێندێکیان لایەنی لۆپێنیان بەخۆوە گرتبوو.

بەلام ئەو ئەزموونو تەجرەبانە فرسەتیان پێدام کە تێکەڵاوێکی قورسو قایم لەگەڵ خەڵکی بەرقەرارکەم.

لەماوەی نێوان ساڵەکانی 65و66هەستو ئیحساسێکی ناخۆشو دڵتەنگیەکی لەرادەبەدەر بەسەرم دا زاڵ بوو.

لەو کارانەی دەمکردن ڕازیو خۆش نوود نەبووم. لەساڵی 66 هەوڵو کۆششم لەبارەی ئەو فیلمانەی کایەمان دەکەم پتر وەسواس دوودڵی بەخەرج دەمو دەستم کرد بەکایەکردنی فیلمی ئیجابیو باش.

بەلام لەهەمان کاتدا بەهۆی پێداویستی ماڵی ناچار بووم فیلمی مەنفیو خراپیش کایەکەم.

چونکە لەوکاتەوە کەدەستم بەئیشی هونەری کرد مەبەستم ئەوەبوو کە لەنێو خەڵکیدا خۆشەویست بم، بۆ خۆم بتوانم فیلم دروست کەم. بەلام تەنها ڕێگایەك کە بۆم مایەوە ئەوەبوو کە کارێکی هونەری پیشەیی بۆ خۆم هەڵ بژێرم، هەوەڵین هەنگاوم لەساڵی 1968 هەڵهێناوە.

لە ساڵی 1968 دووای هەوڵ دانم وەك فیلمسازێك، چوومە خزمەتی سەربازی کە دووساڵی خایاند.

کە ئەوە ئاڵو گۆڕێکی گرنگ بوو لە ژیانی مندا. کە بۆ هەوەڵێن جاربوو ماوەی دوو ساڵ وەختم کرد سیستماتیك بخوێنمەوە، ئەوە ناگەیەنێ کە پێشتر نەم دەخوێندەوە.

دەم خوێندەوە بەلام بەرێکو پێکی نەبوو. لایەنی پراکتیکی سینەمایی گرنگیەکی زۆریان بوو لە ژیانی مندا، سەردەمی خزمەتی سەربازیم توانیم سیستماتیك کتێبەکانی- لینین، مارکس مائو بخوێنمەوە.

خۆم ئامادەو قۆچاغ کردبوو کە دوای تەواو بوونی سەربازیم هەوەڵین هەنگاوی بەکەڵك هەڵێنمەوە، ئەوە شتێك بوو کە لەساڵی 1970 ڕوویدا.

کاتێ سەربازیم تەواو کرد هەوەڵین فیلمی گرنگی خۆم بەناوی (ئومێد) چێ کردوو هێنامە کایەوە.

بۆ چێ کردنی ئەو فیلمەو، دابینکردنی خەرجیو مونتاجی بەهۆی ئەوەی ئامادەکاری فیلمەکەش بووم، هاوکات ناچاربووم لەفیلمە کانگتری کانیشدا کایەبکەم بۆ ئەوەی پارەیەك بۆ فیلمەکەم وەدەست بێنم.

لەوڕووەوە لێکۆڵینەوە سیاسییەکانی من بووە هۆی تێکەڵاویو تەماسم لەگەڵ ڕێکخراوە سیاسییە جیاجیاکان، چونکە ڕێبازو موازەعی ڕوونم نەبوو بۆیە دانیشتنەکانیشم لەگەڵیان جیاوازبوو.ئەو سەردەمانە ڕێکخراوی جۆراو جۆرمان بوو، ڕێکخراوی دانشجویی ڕێکخراوی کرێکاریی



لەدژی نیرو کۆنەپەرستەکان، بۆیە من زۆریان لێ نزیك بووم و یارمەتیم دەکردن، و لەساڵی 1973، ئەندامێکی ئەو ڕێکخراوەی کە من یارمەتیم دەکردن، دەستگیرکراو منیش بەهۆی یارمەتی کردن بەوان خرامە زیندانەوە.

بەلام ئەو دەست بەسەری ساڵی 73وەرچەخانێك بوو لەژیانمدا، چونکە لەزیندان بەهۆی تۆڕی نهێنیەوە توانیم فێری مارکسیزم لینینزم بم. من لە بارەی ڕاپەڕین، ڕویزیونیسمو شورەیی شتهایەکی بەنرخ فێربووم.

لەوکاتانەشدا حازرنەبووم شورەوی وەك ولاتێکی سوسیال ئەمپریالیست ناوبەرم دەم زانی ولاتێکی سۆسیالیستی نیە.

لەهەمان کاتدا فێر بووم کە چۆن مەیلی سەربەزیوانە کە بۆچونی تاقمێ لەڕێکخراوە وردە بۆژوازی کان بوو وەیائەوەی کە ڕێکخراوە واقیعی سوسیالیستی چۆن بێ باشە لێك جیاکەمەوە، من لە بارەی دەورو نەفسی ڕێبەری چینی کرێکار زۆر شت فێر بووم.

ڕەفتارو ئاکاری خۆم گۆڕی زۆرتری لایەنی ڕەفتاری شۆڕشگێرانەم بەخۆوە گرت، وەلەبارەی سینەماوە، هەروەها دەستم کرد بەفیکر کردنەوە لە وردە کاریەکانی کە چۆن فیلم دروست کەم.

بۆیە ڕوانگەیەکی قوڵو ورد بینانەم لەبارەی تیۆری سینەماوە پەیداکرد. هەر کە لەساڵی 1974 لە زیندان ئازادبووم جارێکی کە هەنگاوێکی گرنگی کەم لەکاری سینەمایی داوەك فیلم سازێك هەڵێناوە.

ساڵی 74، کاتێ لە سازوپێکی فیلمی دووهەمی خۆم دابووم، چوومەوە زیندان.

ساڵی 74–تا 81 لەزینداندابووم و لەوێ ڕۆمانو کورتە چیرۆکم دەنووسی نووسراوی سیاسیشم هەبوو وپێنج فیلمم سازکرد، دوودانەیان زۆر سەرکەووتوو نەبوون بەلام سێ دانەیان کە خۆم نەقشو دەوری بەرچاوم تێ دابوو نێو بانگی عالەمیان پەیدا کرد. فیلمەکانم ئەوانەن: "مێگەل"، "دوژمن" ، کەئاخیر دانەیان "یۆڵ" لەوانی دیکە زۆرتر پەیوەندی بەمنەوە هەیە چونکە لەرێكو پێکی فیلمەکە کەخۆم ڕاستەوخۆ کارم بۆ کردوو، ئێستا کەئیمکاناتی باشترم هەیە بەلام لەتاراوگە بەسەر دەبەم. مەبەستم ئەوەیە بەو ئیمکاناتە ئەگەرتوانیبام لەولاتەکەی خۆم فیلم سازبکەم، دەم توانی کاری جۆراو جۆرو هەتاباشتریش ئەنجام دەم، بەلام لەوەی بەدواوە ئەوەی بتوانم بەنمایشی دەرێنم، کەسایەتی هونەری من دەنرخێنێ.

***ئەم نووسراوە لە گۆڤاری (جیهان برای فتح) لە زمانی فارسیەوە وەرگیردراوە بۆ زمانی کوردی. لاپەڕە 71-73**

**عەبدول ئەحەد ئەحمەد زادە**

# یەڵماز گیونای ئەدیب و هونەرمەندو تێکۆشەر

**فەرەیدون بێستانسوری**

سەیرنی‌یە مرۆڤ لە ولاّتێکدا بژی بەڵام حسابی کۆیلەی بۆ بکرێ، زمان‌و مێژووی خۆی لێ یاساغ کرابێ‌و لێی شێوێندرابێ، هەموو مافێکی سەرەتایی‌و مرۆیی خۆی لێ زەوت کرابێ.

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا ئەو مرۆڤە ببێتە سیمبوڵی داهێنان. ئەو کەسەی کە دوژمنەکانی بە (پادشای بێ تەخت‌و تاج) ناویان برد، بەڵام نموونەی (پادشای شکۆمەند) بوو لەجیهاندا..

لەڕاستیدا بەپێویستم زانی کەئەم باسە لەشێوەی (لێکۆڵینەوەیەکدا) بخەمە بەردەستی خوێنەران‌و ڕۆشنبیران‌و عاشقانی هونەرو ئەدەب، چونکە هەتا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ‌و زانستی یانەم نەدیوە لەسەر ژیان‌و بەرهەم‌و هەڵوێستە سیاسی‌یەکانی (یەڵماز گیونای)، جگە لە نووسینی کورت‌وپچڕ پچڕ لەم ڕۆژنامە یان ئەو گۆڤار، کەبەداخەوە زۆربەی ئەو نوسینانەی کەبەرچاویشم کەوتوون هەڵەو کەم‌و کوڕی زۆریان تێدابووە، سەبارەت بەژیان‌و بەرهەمەکانی، بۆیە لەم لێکۆڵینەوەیەدا زۆر هەوڵم داوەپشت بەو چاوپێکەوتنانە ببەستم کەلەگەڵ خودی خۆیدا کراوە، لەگەڵ سەرنج‌و تێڕوانینی خۆم لەسەر فیلمەکانی‌و هەندێ بابەتی ئەدەبی، (ئەوەندەی کە چنگم کەوتبن)، تالەتواناشمدا بووبێت‌و هەرچی شوێنێك کە زانیبێتم بابەتێکی لێیە سەبارەت بەم باسە شوێنی کەوتووم.

چونکە لەڕاستیدا مەگەر تەنها (هەندێ لەفیلمەکانی‌و هەندێك نووسینی کەمیش لەسەر ژیان‌و هەندێ بەرهەمی کەمی ئەدەبی) نەبێت کە لێرە چنگ ناکەون، بەڵکو زۆربەیان لەکتێبخانەکانی تورکیا تۆزیان لەسەر نیشتووە، کە کەس ناوێرێ بیان کڕێ، هەندێکیشیان لەئەوروپان بەتایبەتی



ئەو بەرهەمانەی کەلەدوای ڕۆیشتنی خۆی بۆ ئەوروپا بەئەنجامی گەیاندون لەگەڵ ئەو نوسین‌و لێکۆڵینەوانەی کەلەوێ لەسەری نووسراون وەکو ﴿نامەی ماجستێرەکەی لێکۆڵەرەوەی فەرەنسی (جان مارك بینیە)﴾ کە شایەنی ئەوەیە وەرگێڕدرێتە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی هەندێکی تر ئاشنامان بکات بەجیهانە فراوانەکەی (یەڵماز گیونای).بابەتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە دەکرێن بەچوار بەشەوە:

بەشی یەکەمی تەرخان کراوە بۆ (ژیانی هونەرمەند)، بەشی دووەمی تەرخانکراوە بۆ ڕادەربڕینێکی گشتی لەسەر سەرجەم (بەرهەمە سینەمایی‌یەکانی)و لێدوانێك لەسەر هەردوو فیلمی (مێگەل و ڕێگا "یۆڵ")، بەشی سێ‌یەمیشی تەرخانکراوە بۆ هەندێ لە (بەرهەمە ئەدەبیەکانی)، بەشی چوارەمی لەسەر (نەخشە سیاسی‌یەکانی (یەڵمان)و چۆن توانیوویەتی وەکو شۆڕشگێڕێك (هونەرو سیاسەتی دروست) ئاوێتە بکات.

ژیانی یەڵماز گیونای:

قەدەر وای خواست، ﴿کچە کوردێك بەناوی (گوڵێ) لەناوچەی (مووش)ەوە بەهۆی کارەساتەکانی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، وڵاتی خۆی بەجێ‌بێڵێ‌و بێتە ناوچەی (ئەدەنە)، کوڕە کوردێکیش کەناوی (ئەحمەد) بوو لە خێڵی (زازا) لەناوچەی (شیڤەرەك)ەوە، بەهۆی شەڕو شۆڕی خێڵەکی‌یەوە ناوچەکەیانی جێهێڵاو چارەنووسیش هەردووکیانی لە گوندی (یەنجە)ی نزیك (ئەدەنە) بەیەکەوە گرێ‌دا، ئەنجام لەساڵی (1937) نەوەیەکیان خستەوە کە (کورد) شانازی پێوە دەکات، ئەویش (یەڵماز گیونای) بوو، (یەڵمان) بەزمانی تورکی، بەواتای (نەترس) دێت، ئەویش ناوەکەی ون نەکرد، ( ڕەنگیشە هەر ژیانی پڕ کوێرەوەری‌و ئازاری گەلی کورد وای کردبێت کە مرۆڤی کورد وشەکانی نەترس‌و ئازایی‌و قارەمانی خۆش بوێت).[2]

ئەو ناوچەیەی کە (یەڵمان) تیایدا هاتە دنیاوە، دەکەوێتە خواروی ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە، ﴿ناوچەکە بەئیش‌و کار بەناوبانگە، بەتایبەتی بەچەقی بنچینەیی دائەنرێ بۆ بەرهەم هێنانی لۆکە، هەروەها بەوە ناسراوە کە ژمارەی دانیشتوانی لەزیاد بوونێکی بەردەوام دان، پیاوان بەزۆری چەك هەڵ دەگرن لەگەڵ خۆیانداو لەنێو زنجیرەیەکی شەڕدا دەژین﴾[3](یەڵماز گیونای) هەر لەمنداڵیەوە شانی دایە ژێر باڵی کارکردن‌و ﴿لەئیشێکەوە ئەچووە سەر ئیشێکی تر، جوتیاری‌و گۆشت فرۆشی‌و چەندەها ئیشی تر﴾[4] ﴿ئامانجی باوکی ئەوەبوو، ببێ بەقەپانچی پەموو، بەڵام خۆی دەیەوێ ببێ بەچی؟!.. خۆیشی نازانێ﴾[5].

بۆ (یەڵمان)ی هەست ناسكو بیر تیژ زۆر بوو بەكردەوە لەگەڵ كۆمەڵێك خەڵكی سادەو زەحمەتكێش دا بژی، كە ئەمانە لەدواییدا بوونە بابەتو كەرەسەی بەرهەمە ئەدەبیو هونەریەكانیو هەروەها هزرو بیری (یەڵمان)یشیان فراوان كرد لەڕووی ژیانی (كۆمەڵایەتیو چینایەتیو سیاسی)یەوە، كە هەر ڕەنگدانەوەی ژیانی خۆی بوو لەنێو خانەوادەیەكی جوتیارو كۆمەڵگایەكی دوا كەوتوو لەهەر ڕوویەكەوە دەستی بۆ بەری، لەناو سەرجەم بەرهەمەكانیو هۆشیاریی‌یە سیاسیو بیری یەكەیدا بەڕوونی دەركەوتو ڕەنگی دایەوە.

یەڵماز خۆی دەڵێ : ﴿ هەر لەسەرەتاوە من ئایدۆلۆجیەتی جووتیارانەم هەڵگرت، لەكاتێكدا خۆشم بەشێك بووم لەنەتەوەیەكی چەوساوەو ستەم دیدە كەنەتەوەی كوردە﴾[6].

(یەڵمان) دەبوایە لەلایەك ڕووبەڕووی ئەو بارو دۆخە ناهەموارە كۆمەڵایەتی‌یە ببێتەوەو هەروەها باری قورسی ژیانی نایەكسانیو ناعەدالەتی لەڕوی چینایەتی‌یەوە كە خۆی وەكو كەسێكی ڕەنجكێشو كرێكار لەنێو ئەوبارو دۆخە دەژیاو لەلایەكی دیشەوە بەشێك بوو لەو ملیۆنان خەڵكەی بەدەست ستەمی میللیەوە دەیناڵاند.

كەپێم وایە ئەوەشیان هۆكاری سەرەكیو بزوێنەری یەكەمی بوو كە هەموو ڕێچكەكانی خەباتو تێكۆشانی تێدا ڕاگەیاندراو هەژێنرا، ((یەڵمان) خۆی پێمان دەڵێ : ﴿ئەم كارتێكردنانە بوو پاڵی پێوە نام كە بەدوایشتێكدا بگەڕێم، ئەو كاتە نەمدەزانی بەدوای چیدا دەگەڕێم، بگرە نەشمدەزانی هۆگری چی دەبم، بەڵام بەردەوام بەدوای شتێكدا دەگەڕام، تا لەسەرەتای پەنجاكاندا، بەچەند كەسانێك ئاشنا بووم، بۆ نموونە: بەشیعرەكانی (نازم حیكمەت) شاعیری (كۆمۆنیستی توركیا) ئاشنا بووم، كەشیعرەكانی دەربارەی (جەنگی میللی ئیسپانیا) بوو﴾[7].

هەر لەسەرەتاوە (یەڵمان) لەڕێگەی ئەدەبەوە ئاشنایەتی لەگەڵ جیهانی ڕۆشنبیریو سیاسەتدا پەیدا كرد، هەروەهائەو خۆ خواردنەوەو فشارە ناوەكیانەش بوون كە بوركانی داهێنەرانەی ئەدەبیو هونەریو فیكری شۆڕگێڕانەی (یەڵمان) یان تەقاندەوە، كەلەم بەشەدا هەوڵ دەدەم بەگوێرەی قۆناغ باس لەچۆنیەتی ژیانو داهێنانە هونەریو ئەدەبیو ڕۆشنبیری‌یەكانی بكەم، هەرچەندە هەڵوێستی سیاسیو خەباتی شۆڕگێڕانەی (یەڵماز گیونای) بەچركەو سەعات لە ژیانی دابڕاو نەبوو، لەبەرئەوە نەمتوانیوە لەباسی ژیانەكەشیدا خۆم لە لەهەڵوێستی سیاسیو بیرو باوەڕی لابدەم لەم بارەیەوە.

﴿ لە ساڵی (1952) (یەڵمان) یەكەم چیرۆكی لەگۆڤاری (بیرگوین-Birgun)دا بڵاودەكاتەوە، كەلە سەر (شەڕو شۆڕی لادێ)بوو. هەرلەوكاتەوە بیرو باوەڕی سۆسیالیستیو هۆشیاری سیاسی (یەڵمان) بەدەر دەكەوێت ﴾[8].

﴿ هەرلەساڵی 1952 ڕەشبگیری كۆمۆنیستەكان كرا لەتوركیا، لەناو ئەوانەدا



چەند شاعیرێك گیران، (یەڵمان) شیعرەكانی ئەوانیشی خوێندەوە ﴾[9].

﴿ لەساڵی (1955)دا چیرۆكێكی كورت دەنووسێ، كەهێشتا لە قوتابخانەدەبێ بەتاوانی پڕو پاگەندە بۆ كۆمۆنیستەكان دەدرێ بەدادگاو لەساڵی (1957)دا لەكاتی دادگایی كردنەكەیدا ناچار دەبێ شاری (ئەدەنە) ئەو شارەی كەدەورانی هەرزەكاریو منداڵیو خوێندنی سەرەتاییو ئامادەیی تێدا بەسەر بردووە بەجێ بهێڵێو ڕووبكاتە شاری (ئەستەمبووڵ)﴾[10].

﴿ كۆتایی چیرۆكەكە بەم هاوارە دێت (ڕۆژێ تۆ كۆتاییت پێ دێت) ئەمە وتەی جوتیارێك بوو بە ئاغاكەی﴾[11]، ناوی چیرۆكەكەش (هاوكێشەیەك بەسێ نەزانراو)[12] بوو.

كە دیارە ئەم جۆرە هاوارانە لەوڵاتێكدا كەلەسەر بنەمای بیری (بێدەنگ كردن)و (خاپاندنی) (كبت) هەموو جۆرە قیژەیەك كە لە خزمەت بیری مرۆڤایەتیو دادخوازی چینایەتیو كۆمەڵایەتی دابێت شتێكی یاساغو گوناهێكی گەورەیەو لەبەرامبەری (فەرمەنڕەوای سەردەمدا كراوە).

(بۆیە لە ساڵی(1961)دا حوكمی دووساڵو نیو زیندانو دوورخستنەوەی بەسەردا دەسەپێنن)[13].

(پێش ئەوەی حوكمی زیندانی‌یەكەی بەسەردا بسەپێنن هەر لەساڵی (1958)دا لە كۆلیجی ئابووری زانكۆی ئەستەمبول وەردەگیرێو هەر لەهەمانساڵیشدا وەكو (سینارستی هاوبەشو ئەكتەر) بەشداری لە فیلمی (ئالاگایك) لە دەرهێنانی (عاتف یەڵمازا)دا، دەكات)[14]، هەروەها لەفیلمی ﴿(منداڵانی ئەم وڵاتە)و (لەبەرگی زەردو سووردا) دەور دەبینێ، كەهەر لەدەرهێنانی هونەر مەند عاتیف یەڵماز بوون ﴾[15].

بەڵام بەهۆی زیندانیەكەیەوە ناچار دەبێت بۆیەكجاری دەست لەخوێندنی زانكۆ هەڵگرێ.

﴿لەنێوان ساڵەكانی (1961-1963) (یەڵماز گیونای) ژیانی لەزیندانو بەدوور خراوەیی بەسەر برد﴾[16].

﴿لەساڵی (1961) لە بەندیخانەدا ڕۆمانی (ئەوان بەكەساسی مردن-Boynu Bukuk Olduler )ی نووسی، كە ئیلهامی نووسینی ئەم ڕۆمانەی لە ژیانی خۆی وەرگرتووە﴾[17].

﴿لەدوای ساڵی (1963)و پاش ئەوەی لەزیندان ڕزگاری دەبێ، گۆڕانكارییەكی گەورە لە ژیانی هونەری ((یەڵماز گیونای)دا ڕوودەدات، هەر لەزیندانەوە بڕیاری ئەوە ئەدات كە ئازاد كرا، وەكو ئەكتەرێك كار بكات تا بتوانێ ئامانجەكانی جێ بەجێ بكات.

هەر بۆیە پێش وەختو ئەو دەمەی كە لەزیندان بوو گشت بەرنامەكانی داڕشتو شتەكانی لەلای خۆیەوە زۆر زیرەكانە تاووتوێ كرد، ئەوە بوو لە ساڵی(1965)دا (یەڵمان) یەكێ: بوو لەخۆشەویسترینو بەناو بانگترین ئەكتەرەكانی توركیا﴾[18].

لەپاش زیندانی كردنەكەی، بەبڕوایەكی تەواوو شارەزایی‌یەكی زیاترەوە هاتەوە مەیدانی سینەماو لە میلۆدراما بازرگانی‌یە توركی‌یەكاندا سەركەوتنێكی بێ هاوتاو

نازناوێکی تازەی دەست کەوت بەشێوەیەك کە لەماوەی (پێنج ساڵدا) توانی لە (60) فیلمدا هاوبەشی بکات.

لەساڵی 1968دا پاش ئەوەی خاوەن کارەکەی دەری دەکات چونکە دەڵێ: (کۆمۆنیستێك لەلای من جێی نابێتەوە)

یەڵماز بۆ خۆی فیلمێ دەردەکات: (بووکی زەوی) کە بەسەرهاتی بەزۆر شوپێکردنی ئافرەتی کورد نیشان دەدات)[19].

﴿پاشان فیلمی (سەیدخان)یشی دەرهێنا، کە یەڵماز خۆیشی ڕۆڵی سەرەکی لە فیلمەکەدا دەبینی﴾[20]

(ئەم دوو فیلمە (بووکی زەوی‌و سەید خان- Seyit Han)، باس لەداب‌و نەریت‌و پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتی‌یەکان)[21] و(مەسەلەی بەزۆر شوو پێکردنی ئافرەتی کورد دەکات)[22]. کە ئەمەیان تایبەتە بە فیلمی یەکەم.

(یەڵمان) دەڵێ: (لەنێوان ساڵەکانی 1965-1966)دا، هەستێکی دڵ تەنگی زۆر ڕووی تێکردم، هیچ دڵخۆش نەدەبووم بەو کارانەی کەدەمکردن، لەساڵی (1966)یشدا، هەوڵمدا تەنها لەفیلمە چاك‌و بەسوودەکاندا ڕۆڵ ببینم، ئەو فیلمانەی کە ڕۆڵیان تیادەبینم خۆم سەر پشکبم تیایاندا، بەڵام بەهۆی چەند هۆکارێکی ئابووریەوە کە پەیوەندی بەخەرجی فیلمەکانی‌یەوە هەبوون وایان لێکرد کە لەهەندێ فیلم (هەرچەندە بەدڵی خۆی نەبوون) ڕۆل ببینێ)[23].

چونکە لەدوای قۆناغی زیندانی‌یەکەی (یەڵمان) بڕیاری دابوو، وەکو ئەکتەرێکی سەرکەوتوو دەست پێبکات، هەروەها مەبەستی سەرەکی یەڵماز ئەوەبوو کە خۆی بە جەماوەر بناسێنێ بەهیوای ئەوەی کە خۆی بتوانێ فیلم دەربکات، ئەمەش وای لێکرد کە هەر وەکو ئەکتەر لەپشتی کامێراوە ڕابوەستێ بۆ ئەوەی بتوانێ ئامانجە ڕاستەقینەکانی خۆی جێبەجێ بکات ئەوەبوو یەکەم هەنگاوێکی سەرکەوتووانەی کە(یەڵمان)ی دڵخۆش کرد، بەرهەم هێنانی ئەو دوو فیلمەی بوو لە ساڵی (1968)دا.

لە ساڵی (1968) پاش یەکەم هەوڵ‌و کۆششی وەکو فیلمسازێك، بانگ کرا بۆ خزمەتی سەربازی، کەدوو ساڵ درێژەی کێشا.

لەماوەی ئەم دووساڵەدا (یەڵمان) فرسەتی خواست بۆ ئەوەی بتوانێ بەشێوەیەکی ڕێك‌و پێك‌و بەبەرنامە ئەو ماوەیە بۆ خوێندنەوە تەرخان بکات، (یەڵمان) دەڵێ : (ئەوە نی‌یە کەپێشتر نەمخوێندبێتەوە، بەڵام ئەم جارە جیاوازی هەبوو لەگەل جارەکانی پێشوودا، چونکە لەپێشدا هەم کاری سینەما سەر قاڵی کردبووم، هەمیش خوێندنەوەکانم ڕێك‌و پێك نەبوون).

بۆیە لەو ماوەیەدا (بەبەرنامە) کتێبەکانی (لینین‌و مارکس‌و ماو) دەخوێنێتەوە)[24].

لەساڵی 1969شدا، سیناریۆی فیلمی (گورگە برسی‌یەکان) دەنووسێت[25]

لەپاش تەواوکردنی خزمەتی سەربازی‌و لەساڵی (1970)دا، هەنگاوێکی زۆر گرنگی هەڵهێنا ئەویش بەرهەمهێنانی سیناریۆی یەکەم فیلمی‌بوو بەناوی (ئومێد) [26].

کە نووسەری شۆڕگێڕی تورکیا (نیهات بهرام) سەبارەت بەم فیلمە دەڵێ: ئەم فیلمە بەسەرەتای ڕێچکەیەکی تایبەت دادەنرێ (لەتورکیادا) ئەویش قوتابخانەی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی‌یە، بەڕای نووسەر فیلمی (ئومێد گرنگترین فیلمی مێژوویی سینەمایی تورکیایەو باشترین ئیشی (یەڵماز گوینای) بوو.

ڕووداوەکانی فیلمەکە دەربارەی خێزان، زەوی، خەباتی خەڵك‌و پەیوەندی نێوان ڕەش‌و ڕووتترین‌و بێچارەترین توێژی کۆمەڵایەتی‌و جیاوازی نێوان ئایدیالیزم‌و ڕیالیزم نیشاندەدرێ کە لە کۆتاییدا بەسەر کەوتنی ڕیالیزم کۆتایی پێ دێت، ئەمە چیرۆکێکی واقیعی ژیانە نەك شتێکی خەیاڵاوی، پاڵەوانی سەرەکی فیلمەکە بەدوای دەوڵەمەندیدا وێڵە، تا بتوانێت گیرو گرفتەکانی خۆی پێ چارەسەر بکات، بەڵام کاتێك ناتوانێ ئەو ئامانجە بەدەست بێنێ، شیرازەی خێزانی بەتەواوی تێك دەچێت، هەموو شتێك خراپ دەبینێ، بۆیە لە ئەنجامی نائومێدی خۆیدا شێت دەبێ. ئەمەیەکەمین فیلمە کە یەڵماز لە ڕۆڵی قارەمانێتیدا لێدانی تێداخواردبێ لەبری ئەوەی وەکو کەسێتیەکی بەهێز لەفیلمەکەدا دەربکەوێت، لەبەرئەوە دەتوانین لایەنە سەرەکیەکانی (ڕیالیزم) لەم فیلمەدا ببینین، یەڵماز لەم فیلمەدا تەواوی بەهرە هونەریەکانی خۆی بەکارهێناوە، کاتێك (ئیلیا کازان) ئەم فیلمەی بینی، گوتی:

(ئێمە لەبەرامبەری فلیمسازێکی زۆر گەورە وەستاوین).

فیلمەکە هەر بەزوویی لەتورکیا بەتۆمەتی دژایەتی‌کردنی مەزهەب‌و دژایەتی کردنی ڕژێم‌و بزواندنی‌چینی هەژاران بەرامبەر دەوڵەت، تاوانبارکرا.

فیلمی (ئومێد) لەرێگەی یاساغەوە برایە دەرەوەی تورکیاو لە ڤیستڤاڵی (فیلمدا)نیشاندراو خەلاتی تایبەتی پێ بەخشرا، یەڵماز بەهۆی ئەوەی کە فیلمی بەیاساغی ناردۆتە دەرەوەو ژیانی نالەباری جوتیارێکی تورکی نیشان ولاتانی دەرەوە داوە، حکومەتی تورکیا خستیانە ژێر چاودێریەوە.[27]

هەر لەدەوروبەری ئەو ساڵانەدا، یەڵماز کۆمپانیایەکی فیلمی بەناوی (گۆنەی فیلم) دامەزراندو خۆیشی وەکو (دەرهێنەرو کرێکارو سینارست) کاری تیادەکرد.

نزیکەی (20-30) سیناریۆی فیلمی نووسی، کە بەشێوەی پەرتووك کەوتە بەردیدەی خەڵك‌و بڵاوبوونەوە، خەڵکێکی زۆر لەشێوەی ڕۆماندا دەیانخوێندەوە، تا ساڵی 1968 یەڵماز بووە هونەرمەندێکی ناسراوو بەناوبانگ، ئەمەش لەرێگای فیلمەکانی‌یەوە ناسرا نەوەکو بەهۆی بزوتنەوەیەکی سیاسی یان ڕێچکەیەکی سیاسی‌یەوە[28]. ئیتر هەر لەفیلمی (ئومێد)ەوە فیلمەکانی دوایی یەڵماز ڕێچکەی پێشووی لەسینەما گۆڕی، واتە شێوازی (یەك پاڵەوانی) لەفیلمەکانیدا، ئەمجارەیان یەڵماز پاڵەوانی ڕاستەقینەی لەناو میللەتەوە هەڵبژاردو کردنیە (ئۆبرەزی وێنە)ی، مەرگەساتەکانی کۆمەڵ، کەپێم وایە کاریگەری ڕاستەوخۆی فیلمەکان لەپاش ئەم قۆناغەوە گەیشتنە ئەوپەڕی، ئەوەش لەفیلمەکانی (مێگەل‌و یۆڵ (ڕێگا،دیوار)دا، سنووری هونەرمەندێتی‌و واقیعبینیان بەزاندو زۆر بەڕوونی‌و ئاشکرایی بەدەر کەوتن. ئەم جۆرە پێشکەوتنەش لەسینەمادا، هاوکات بوو لەگەڵ پێشکەوتنی دیدو بۆچوونی فیکری‌و گەشەی ڕۆشنبیری‌و دەوڵەمەند بوونی ئەزموونی.

(هەر لەساڵی 1968ەوەو بەکاریگەری ئەو شۆڕش‌و ڕاپەڕینە گەورانەی لە فەڕەنساو ئەمەریکا بەرپابوون لەسەر دەستی لاوان‌و خوێندکاران،تورکیاش پریشکی ئەم جموجۆڵانەی بەرکەوت‌و

خەڵکی تورکیا خەریکی نەخشەکێشانی هێڵی ئاشکرایان بوون لەنێوان بۆچوونە جیاوازەکاندا[29].

هەر لەوکاتەوەو بەتایبەتی لەساڵی 1970 بەدواوە، گەشتە سیاسیەکانی یەڵماز بەرەو چەند بزووتنەوەیەکی جۆر بەجۆر پەلیان هاویشت، ئەوکاتە چەند بزووتنەوەیەك هەبوون، وەکو (بزووتنەوەی خوێندکاران)و (بزووتنەوەی کرێکاران) کە یەڵماز هاوکاریو پشتیوانی لێدەکردن دژی هێزە کۆنەپەرستەکان، بەلام وەکو خۆی دەڵێ من هەر هەڵوێستێکی ڕوونو ئاشکرام نەبوو، بەڵکو پەیوەندیەکانی ئەو بزوتنەوانە سنووردرابوون[30].

لەساڵی 1971دا، یەڵماز جەماوەرێکی گەورەی بۆ خۆی پەیداکردبوو، چەپڕەوەکان، وەکو هونەرمەندێکی هەوەسو سێکسو ڕادیکاڵیکی دوودڵ سەیریان دەکردوو، ڕاستڕەوەکانیش وەکو بەکرێگیراوێکی مل هوڕی کۆمۆنیست.

لەم ساڵەدا هەشت فیلمی کەوتە بازاڕەوە، کە کاربەدەستانی ئەوکاتەش (وەکو ئێستا سەربازی بوون)، کەوتنە دڵە ڕاوکە، چونکە فیلمە (گێرەشێوێنەکانی) سەرنجی خەڵکیان ڕادەکێشا.

هەر لەساڵی 1971 دا، لەفیستڤاڵی فیلمە تورکیەکاندا، لیژنەکە بەتێکڕای دەنگ، یەڵمازیان، بەچاکترین ڕێژیسیۆرو ئەکتەری سینەمای تورکیا هەڵبژاردو، ئەم هەواڵە گۆڤاری (ڤاریتای ئەمریکی ڕایگەیاند) بەلام بەفەرمانێکی بالاتر لە دەسەلاتی ئەو لیژنە دادوەرە، ئەو بڕیارە هەڵوەشێنرایەوەو جایێکی تر خرایە دەنگدانەوەو هونەرمەندێکی دیکەیان هەڵبژارد[31].

لەساڵی 1972 بەدواوە، ئەستێرەی بەختی یەڵماز بەچەپگەردی وەردەچەرخێ، بەدرێژایی ئەو سالانەی دوایی ژیان لەزیندان بەسەر دەبات، بەلام لەهەر زیندانێك، زیندانی کرابێت شۆڕشێکی بەرپا کردووە، لەهەرزیندانێك میوان بوبێت بەماوەیەکی کەم زۆربەی زیندانییەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، وەکو خۆی دەڵێ، "هەندێ جار بەتەنها زیندانییەکانیش نا"[32].

ئەوەبوو لەساڵی 1972 ئەندامی یەکێ لەو ڕێکخراوانەی کە یەڵماز کۆمەکی پێشکەش دەکردن گیراو یەڵماز یشیان بەتۆمەتی پشتیوانی لێکردنی ئەو بزووتنەوەیە هاویشتە زیندانەوە[33].

بەلام کاتێك مرۆڤ قاڵ دەبێ لەبەگژا چوونەوەدا، ئیدی هیچ باکی لەئەشکەنجەو ئازار نامێنێ، یەڵماز لەنمونەی ئەو خەڵکە یاخی بووانە بوو، یاخی بوون دژی چەوساندنەوەو ستەم، دژی سیاسەتی کپ کردنی دەنگی ئازاو دژی جاڕدانی لەناوبردنی (کەلتور- زمان- ڕۆشنبیری- ژیان)ی میللەتانی بندەست، یاخی بوون لەپێناوی ژیانێکی (ئازاد)دا....بۆیە شانازی بەگرتنەکەیەوە دەکاتو بەشاکارە ئەزموونێکی تری دادەنێت.

لەساڵی 1972 یەڵماز بەحەوت ساڵو نیو زیندانی کرا[34]. بەلام ئەم گرتنە بەخاڵێکی گرنگی وەرچەرخاندن لەژیانی ئەودا دادەنرێ، وەکو خۆی دەڵێ: ( بەسایەی تۆڕە جاسووسییەکانەوە، توانیم فێری زانستی (مارکسیزم-لینینزم)، دەربارەی شۆڕشو دەربارەی (ڕوژیونیزم- تحریفییەت)و دەربارەی (یەکێتی سۆڤیەت) زۆرشت فێربووم، تا ئەوکاتەش نەم دەتوانی سۆڤیەت بەدەوڵەتێکی (سۆسیال ئیمپریالیزم) دابنێم، بەلام دەمزانی ولاتێکی سۆسیالیستی نییە[35] بەڵێ.. ئەم قۆناغەی یەڵماز، بەقۆناغێکی تازە ترو گوڕو تینو پێشکەوتنێکی نوێتر دەژمێردرێت، هەم لەڕوی (فیکری-سیاسی)یەوە، هەم لەڕووی هونەرییەوە.

لەڕووی سیاسیەوە، زیاتر ڕۆچوو بەناخی فەلسەفەی چەپگەرایەتیدا، کە خۆی بڕوایەکی تەواوی پێی هەبوو بۆ ڕزگار کردنی ولاتەکەی، لەلایەنی هونەریشەوە، تێڕوانینە کانی لەڕووی (تیئۆری)یەوە قوڵتر بوونو تاکتیکی تازەشی دانا بۆ ئیشەکانی لەوەدوای کە پاشتر ئەمانە هەموومان بە (پراکتیك) بینی.

ئەو ماوەیەی کە لەزیندانی (سەلیمی)یەی سەربازی بوو، بۆ نووسینو خوێندنەوەی تەرخان کرد.

زنجیرەیەك چیرۆكو نامەی نووسی کە هەر بەناوی (زیندانی سەلیمی)یەوە ناوی نان (Selimiye Uciemesi) و (Selimiye Mektuplari)[36].

لەساڵی 1974دا، باری تورکیا کەمێك هێور بووەوەو کۆمەكو پرۆتێستی بێگانەکانو ڕێکخراوە خێرخوازەکانی وەکو (ئەمنستی) کاریان کردو بەهۆی لێ خۆش بوونێکەوە یەڵماز ئازاد کرا[37].

لەساڵی 1974 کەلەزیندان ئازاد دەکرێ بەڕۆژنامە نووسەکان دەڵێ: ژیانی زیندانیم، بەشێکە لە خەباتی کۆمەلایەتیم، ئێستا پاش ئەو هەموو ماوە دوورو درێژەی لەزیندان بەسەرم بردووە، ئەرکی سەرشانم ئەوەیە درێخی لەخەبات نەکەم[38].

کە لەزیندان هاتە دەرێ فیلمی (هەڤاڵ-Arkadas)ی دەرهێنا، ئەم فیلمە درامای پێك گەیشتنەوەی دوو هاوڕێی سەردەمی قوتابخانەن، یەکێکیان لەڕێگای قۆنتەراتەوە دەوڵەمەند بووەو ئەوی دیکەیان کە (یەڵماز خۆی دەورەکەی دەبینێ) بێ سەرەنجامو دڵ پڕ لەهیوا لەزۆرانبازی ژیاندایەو بڕوای تەواوی بەهاتنەکایەی (سۆسیالیستی یە)[39].

بەلام لەسەرو بەندی فیلمیدووەمیدا کە فیلمی (بێ ئارامی) بوو جارێکی دیو لەهەمان ساڵدا زیندانی کرایەوە نەیتوانی فیلمەکە تەواو بکات. فیلمی (بێئارامی) بەسەرهاتی جوتیارێکی کێڵگەی (پەمو-لۆکە) نیشان دەدات کە دووچاری دوژمنایەتی بووە لەهەمان کاتدا بۆ بەربەرەکانی چەوساندنەوەی چینایەتی بانگی مانگرتن دەدات، بەوجۆرە لەنێوان دوو بەرداشی کۆنەپەرستیو پێشکەوتنخوازیدا گێژدەخوات[41].

چیرۆکی گرتنی ئەم جارەیان لەمانگی (سێبتەمبەری) 1974دا، لەشارۆچکەی (یۆرمۆتالیك) لەخواروی ئەنادۆل ڕوودەدات، کاتێك یەڵماز ئێوارە پاش کارکردن لەگەڵ دۆستو هەڤاڵەکانیدا لە (باڕێکی) شاردا دادەنیشێ، (حاکمێك)ی ڕاست ڕەوی سەرخۆش شالاوی بۆ دێنێو تانەو تەشەری لێدەدات، پێکدا هەڵدەپرژێنو دەبێتە شەڕە گوللەو پاشان حاکمەکە دەکوژرێ، یەڵماز تاوانبار دەکرێ بەکوشتنی (حاکم)و بەهەژدە ساڵ بەندی حوکم دەدرێ[42].

ئیتر هەر لەساڵی 1974ەوە تاوەکو ساڵی 1981 یەڵماز لەزیندان خەریکی نووسینی (کورتە چیرۆكو ڕۆمانو وتاری سیاسیو سیناریۆی چەند فیلمێك) بوو، هەندێ جار ژوری زیندانەکەشی کردبووە شوێنی پرۆڤەی ئەو کارەکتەرانەی ڕۆڵی فیلمەکانی پی دەدیتن.

هەر لەزیندان سیناریۆی پێنج فیلم دەنووسێ، کە دوو فیلمەکەی یەکەمیان

سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا[43]، ﴿ چونکە سیناریۆکانیان زۆر تەواو نەبوون، تا ئەوکاتەش یەڵماز دەڵێ: بڕوایەکی تەواوم بەدەرهێنانی پێکرایی نەبوو، ئەوە باس لەو کاتە دەکەین کە (یەڵماز) لەگرتووخانەدابوو، چونکە پێشتر ئەوکاتەی خۆی دەوری پاڵەوانی دەدیت، هەر خۆیشی سەرپەرشتی دەرهێنانی دەکردو سیناریۆی زیادی لەبەردەست دابوو، ئەم گیروگرفتەی نەبوو[44]. ﴾

بەڵام بۆ سێ فیلمەکەی تر زوو درکی بەم کەمو کوڕییەکرد، بۆیە لەگەڵ ئەوەی سیناریۆکانیان ڕێك و پێك و بابەتی بون، هەر خۆیشی سەرپەرشتی تەواوی دەرهێنان و هەنگاو بەهەنگاوی بەرهەم هێنانی فیلمەکانی کرد، بەڵام خۆی دەری نەهێنا)[45].

ئەوسێ فیلمەی کۆتایی ئەمانەبوون ((مێگەل (Suru)، دوژمن (Dusman) ڕێگا (Yol)[46]، ئەم فیلمانە سنووری بەهرەمەندی و توانا و ناوبانگی یەلمازیان بردە دەرەوەی تورکیا و گەیاندیانە جیهان، کە فیلمی یەکەم و دووەم (زەکی ئۆیکتان) دەری هێناون و (ڕێگاش) شەریف گۆرین دەری هێنا[47].

هەر لەزیندان دوو پەرتووکی گرنگ دەنووسێ، یەکێکیان (چیرۆکەکانی کورەکەم- oglumahikeler)و ئەوی تریشیان ڕۆمانی (ئێمە کورەیەکمان دەوێت، یەك پەنجەرەو دوونان sopapencerecaml- Ikiekmek Istiyoruz) هەروەها لەبەرکتێبە یاساغەکەی تری کەهەر لەزیندان نووسی (لەبابەت فاشیزم-Fasizm uzerine)، حەوت ساڵ‌و نیو زیندانی و دووساڵ و نیو دوور خستنەوەی بەسەردا دەسەپێنن، لەسەر وتارێکی تر (چەند دەستەیەکی سیاسی- siyasi fraksyolar uzerine) ئەوەندەی تر حوکمی بەسەردا دەدەن، هەروەها لەسەر نامەیەك کەبۆ (سینیۆر فیرناندۆ هێراری) کارگێڕی فیستڤاڵی سینەمایی ڤالادایر لە ئیسپانیا نووسیبووی (پێنج ساڵی تر) حوکم دەدرێ، سەرجەمی ئەو ساڵانەی کە حوکمی زیندانی بۆ دەبڕنەوە دەکاتە (سەدساڵ)[48].

نووسەری شۆڕشگێڕی تورکیا (نیهاد بهرام) دەڵێ: من لە زیندان یەڵمازم ناسی دوای گەلێ باس و خواسی هاوبەش، گەیشتینە ئەو بڕوایەی کە بیرو ئامانجی هاوبەشمان هەیە، هەردووکمان نووسەری شۆڕشگێڕین و دەمانەوێت ببین بە (مارکسیزمی، لینینیزمی)، نەخشەمان کێشا کە من بیرەکانی ئەو لەدەرەوەی زیندان بەئاکام بگەیەنم، لەساڵی 1979 دا ڕۆژنامەیەکی (ڕۆشنبیری) کەوتاری (ڕۆشنبیری و سیاسیمان) تێدا بڵاودەکردەوە بەناوی (گوینای) بڵاوکردەوە، بەڵام لەپاش (هەژدە) ژمارە، ئیتر هەموو ژمارەکانیان قەدەغەکردو حکومەت ڕۆژنامەکەی داخست[49]. یەکێکی تر لەو کارانەی کە هاوڕێبازەکەی یەڵماز (نیهاد بهرام) لەدەرەوەی زیندان ئەنجامیدا، بەگەڕ خستنەوەی کۆمپانیای (گۆنیای فیلم) بوو[50]، کەکاتی خۆی یەڵماز دایمەزراندبوو، هەردوو فیلمی (مێگەل و



دوژمن) لەم کۆمپانیایەدا، بەرهەم هێنران.

بەندیخانەی دورگەی ئیمراڵی دەبێتە
**کۆماری گەلی ئیمراڵی:-**

زیندان نەمابوو لەتورکیادا یەڵماز وانەی بەرخودان و تێکۆشانی تێدا نەخوێندبێ، وەك لەهەموو زیندانێکیشدا هەر ڕۆڵی سەرکردەی بینیوە، بەڵام چ سەرکردەیەك، ئەو سەرکردەیە نا کەخۆی سەپاندبێ، یان ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاواتی ناوی (سەرکردەیییەکی) خواستبێ، بەڵکو ئەو بەکردەوە سەرکردەبوو، هەمیشە بەهۆی توانا فیکری و زانیاری و ئەزموونە سیاسیەکانییەوە هاوڕێکانی ناو زیندانی سازو ئامادە دەکردو هوشیاری دەکردنەوە.

لەساڵی 1979 یەڵماز باری تەندروستی زۆر خراپ دەبێ و دەیبەنە نەخۆشخانە، سەیر ئەوەبوو هیچ گرتووخانەیەك نەیدەوێرا ئەم یەڵمازە ترسناکە بگرێتە خۆی، پاشان وەزارەتی داد بڕیاری گواستنەوەی دەدات بۆ (دورگەی ئیمراڵی)، ئەوەبوو ڕۆژنامەکان دەیاننووسی گرتووخانەی ئیمراڵی گۆڕیوەتە (کۆماری گەلی ئیمراڵی)، بەناچاری لەوێشەوە جارێکی دی دەیگوێزنەوە بۆ بەندیخانەیەکی تر[51].

یەڵماز هەمیشە یەکێك بوو لەو ئەکتەرو فیلمسازانەی کە پلەی یەکەمی لەناو سینەمای تورکیدا مسۆگەر کردبوو، لەو بارەیەوە دەرهێنەری بەناوبانگی تورکیا (لوتفی عومەر عەقادر) لەچاوپێکەوتنێکدا، لەگەڵ گۆڤاری ((TURKIYE POSTASI))دا لەرێکەوتی (1984/12/9)دا دەڵێ: (ئەگەر چاکترین کەس لەناو سینەمای تورکیدا دەست نیشان بکەین ئەوکەسە یەڵماز گیونایە، کە پلەی یەکەم بەدەست دێنێ، پلەی دووەم و سێیەم و چوارەمیش هەر لەچارەنووسی خۆی دەبێ)[52].

لەگەڵ ئەوەی تورك هەرگیز ڕازی نەدەبوو هونەرمەندێکی سەرکەوتووی شۆڕشگێڕو پێشکەوتووخوازی کورد بەهۆی تواناکانی خۆیەوە بناسرێ و ئەو سەرکەوتنە گەورانە بەدەست بێنێت، بەڵام لەلایەن کۆمەڵی فیلمسازان و سینەماییەکانی تورکیاوە، ئەوانەی کە هەموو هەوڵێکیان خستە گەڕ بۆ سەرکەوتنی هەوڵەکانی (یەڵمان)، وەکو (لوتفی عومەر عەقادر، عاطیف یەڵماز، شەریف گۆرین، زەکی ئۆکتین، ...)[53]. جێگای گرنگی پێدان بووەو لەهەموو فیلمێکیدا، بینەران و عاشقانی یەڵماز دەگەیشتنە نزیکەی هەشت ملیۆن کەس[54].

لەبابەت نازناوی (پادشای ناشرینی) سینەمای تورکیاشەوە دەڵێ: ڕۆژنامەکان نازناوی پادشای ناشرینیان لێ ناوم، بەڵام بینەران بەنموونەی (جوانی پیاوانم دادەنێن، کەلەسینەما دەستم بەکارکردن کرد، خرامە خانەی پاڵەوانە ناشرینەکانەوە، بەرهەم هێنەران و دەرهێنەرەکان، کەحەزیان لێ نەدەکردم، ناچار بوون دان بەوەدا بنێن کەئەم (لاوە ناشرینە) ڕۆڵەکەی لەئەکتەرە جوانەکان باشتر دەبینێ، لەوکاتەوە وتم: کەئەوان پاشای جوانەکانی شاشەبن با من پادشای ناشرین بم[55].

لەساڵی 1980دا لەوکاتەدا کە تورکیا گۆڕانکاری بەسەرهات و کۆدەتا سەربازییەکەی ئەوساڵە بارودۆخی سیاسی و سەربازی و کۆمەلایەتی و ئابوری تورکیای لەخراپەوە بەرەو خراپتر برد.

لەوکاتەدا یەڵماز بەهەلی دەزانێ و سوود لەو مۆڵەتە وەردەگرێ کە بۆ چەندرۆژێ پێی درابوو، سەرادنی کەس و کاری بکات، بەلام یەڵماز خۆی و (فاتووش)ی خێزانی و دوو منداڵەکەی، تورکیا بەجێ دێڵن و ڕوو لە (پاریس)ی پایتەختی فەرەنسا دەکەن.

یەڵماز لەدوای ڕۆیشتنی لەتورکیا، ئاوا بەگۆڤاری (دێرشپیگل)ی ئەڵمانی دەڵێت: بۆ یەکەم جاری ژیانم، ولآتەکەمم بەجێ هێشت، بەڕاستی ئازارم چەشت، چونکە ((ولآتەکەم لەهەموو شت خۆشتر دەوێت))[56].

هەر لەپاریس و لەساڵی 1982-1983 فیلمی (دیوار) بەرهەم دەهێنێ. ئەم فیلمە دڕندەیی و هۆڤیەتی ڕژێمی فاشستی (تورکیا) نیشان دەدات و باسی دەست گیر کردنی منالە (کوردەکان) دەکات[57].

لە 24-ی شوباتی 1983، یەڵماز گیونای لەگەڵ زانایان و ڕۆشنبیرانی کورد (جگەر خوێن، کەندال، ئۆردیخانی جەلیلی حاجی جندی، قەناتی کوردۆ، عیسمەت شەریف وانلی، توفیق وەهبی، نورالدین زازا).

ئەنیستیتۆی کوردیان لەشاری پاریس دامەزراند[58] ئەم پەیمانگایە، یەکێکی تربوو لەو خەبات و کارە مەزنانەی کە یەڵماز پێشکەشی گەلەکەی کرد.

بۆیە بەبۆنەی تێپەڕ بوونی ساڵێک بەسەر کردنەوەی ئەو مەڵبەندە گرنگەو لەکاتی نزیک بوونەوەی جەژنی نەورۆزدا یەڵماز لە(18-ئازاری-1984)داو لەمەڵبەندەکەدا وتارێکی پێشکەش بە دوو هەزار کەس کردو ئاماژەی بۆ ئەوەکرد: کە (ئەنیستیتۆ، لەخزمەت کەسێک یاخود گروپێکی دیاری کراودا نییە، (ئەنیستیتۆی کورد)، مەڵبەندێکی زانستییەو لەخزمەتی تەواوی نەتەوەی (کورد) دایە...

دەبێ هەر کەس ئەنیستیتۆ وەکو چاوی خۆی بپارێزی و پێشبینی پێشکەوتنی ئەو بکات.......

(ئەنیستیتۆی کورد) شەتڵێک تۆوی سەربەخۆبوونەو بەرهەمی تێکۆشانی نەتەوەی کوردە، بەرەو پێش چوونی و بەهێز بوونی بەخەبات و هاوکاری ئێوەوە، گرێدراوە[59].

یەڵماز بڕیاری دابوو بەکەڵی بژی و هەر بەکەڵیش بمرێت، بڕیارەکەشی گەیاندەسەر.



کاتژمێری (5.30)ی سەر لەبەیانی ڕۆژی 9-9-1984 لەسپێدەی ئەو ڕۆژەدا ئەستێرەی مووشتەری ئاسمانی میللەتێکی بەدبەختی وەکو کورد بەیەکجارەکی و بەنەخۆشی شێر پەنجەی گەدە، کوژایەوە. لەسپێدەی ئەو ڕۆژەدا مرۆڤێکی ماندوو نەناس، خاوەن شەرەف و ناموسی نیشتمانی و نەتەوەیی و خاوەن شەرەفی مرۆڤایەتی، لەیەکێک لە خەستەخانەکانی فەرەنسا و لەناو دڵی ولآتی غەریبیدا، مرد...یەڵماز گیونای، مرد و دنیای گریاند. لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەی دەبەنە ئامۆژگا، ئەو ئامۆژگایەی بەهەوڵ و تێکۆشانی خۆی و هەڤالانی لە پاریس دامەزرا.

لە 13-9-1984 لەکاتژمێری (9)ی سەر لەبەیانی تاکو (1)ی پاش نیوەڕۆ نزیکەی دووهەزار کەس لەبەردەمی (ئەنستیتۆی کورد لەپاریس ئامادەبوون و پاشان بەکەژاوەیەکی تایبەت و لەسەر شانی هەڤالانی خۆی تەرمەکەی بەرێکرا بەرەو گۆڕەپانی (ریپۆبلیک) و لەوێ لە گۆڕستانی (پیر لاشیز) لەگەل پالەوانانی (کۆمۆنەی پاریسدا) بەخاک سپێردرا، دوا داوای یەڵماز ئەوەبوو؛ (سەرمامە بەپەتۆی سەربازەکانی (کۆمۆنە) داملۆشن)[60].

بۆ ڕێز لێنان لە فاتووشی خێزانی و دوو منداڵەکەی چەندین کەسایەتی ناودارو جیهانی، ئامادەی ئەو بەخاک سپاردنەبوون، لەوانە وەزیری ڕۆشنبیری فەرەنسا (جاك لانگ)، بەناوی خاتوو (دانیال-میتران)ەوە، چەپکێ گوڵی خستە سەر گۆڕی یەڵماز، هەروەها سەرەك وەزیرانی یۆنان (ئەندریۆس پاپاندریۆ) بالیۆزی خۆی لە فەرەنسا نارد بەناوی خۆی و حکومەتەکەیەوە، هەروەها گەورە ناودارانی فەرەنسا و (لیۆنیل ژۆپین)سکرتێری یەکەمی پارتی سۆشیالیستی فەرەنسا و (ماکز مەگرە وتز) ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی پەیوەندیەکانی پارتی (کۆمۆنیستی فەرەنسا) و (گۆی هێرنین) ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسا.

هەروەها، هەردوو سینەمایی جیهانی (پاتریك جرو، گۆستا گاڤراس) و نوێنەری چەندین پارتی سیاسی و پێشکەوتووخوازی ئاسیایی و ئەوروپایی و ئەمەریکای لاتین، ئامادەی ئەو مەراسیمە پڕ شکۆیەبوون[61].

هەروەها لەزۆربەی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکانی جیهاندا هەواڵی مردنی یەڵماز بڵاوکرایەوەو بەرنامەی تایبەت پێشکەش کرا بەو بۆنەیەوە، ژمارەیەکی زۆریش بروسکەی ماتەمینی گەیشتە (ئەنستیتۆی کورد) لەلایەن خەڵکی ناسراوی جیهان و پارت و ڕێکخراوی سیاسی دنیاوە.

### بەرهەمە هونەریەکانی یەڵماز
### ڕادەربڕینێکی گشتی لەسەر فیلمەکانی:

سەرەتا دەمەوێت بڵێم، شێوازی یەڵماز لەهونەری سینەمادا، شێوازێکی تایبەتی و جیاواز بوو، لەگەڵ ئەوەی هەرگیز نکوڵی لەتوانا و بەهرەمەندی یەڵماز ناکرێت لەنووسینی (سیناریۆ و دەرهێنان و ئەکتەریدا) بەڵام (دیاردە) ی زۆر دیارو ئاشکرا لە فیلمەکانیشیدا دەبینرێ، کە ئەگەر کەسێك بەشارەزاییەوە مامەڵەی لەگەڵ فیلمەکانیدا کردبێت و فیلیمێکی ئەو ببینێت، ئەگەر یەڵمازیشی تێدا نەدیبێ و ناوی سینارست و دەرهێنەریشی لەسەر نەنووساربێت، دەزانێت بەرهەمی (یەڵماز گیونا)یە چونکە لەزوربەی فیلمەکانیدا (جۆرە گەیاندنێك-ایحاء)ێکی تایبەتی دەبینن، کە بەشێوازێکی سەرکەوتوانەی (قسەکردن-مخاطبة) دادەنرێت لە نێوان بینەرو ئەکتەردا بەواتایەکی تر فیلمەکانی زمانێکی تایبەتیان هەیە هەر لە جوڵەی جەستەو هەڵبژاردنی سیناریۆی بابەتی کە ڕەنگدانەوەی ڕوداوە ڕاستەقینەو هەستیارەکانی کۆمەڵگای کوردو تورکن بگرە هەتاوەکو هەڵبژاردنی ئەکتەرو دەرهێنەری سەرکەوتوو هەروەها هەڵبژاردنی جۆرە مۆسیقاو گۆرانیەك کە یەکسەر مۆرکی ڕەسەنایەتی پێوە بەدی دەکەیت لەگەڵ بەکارهێنانی جل و بەرگ و ڕەشماڵ و پیشەو هەموو ئەو ئامێرو پێداویستیانەی کە هەر لەکۆنەوە موڵکی کوردبوون لەگەڵ نیشاندانی ئەو ناوچانەی کەڕوداوەکانیان بەڕاستی تیا ڕودەدات یەڵماز زیرەکانە وێنەی (شتە دژەکان) نیشان دەدات (لەیەك کاتدا)، کە بەراورد کردنی دەبێتە کارێکی زۆر ئاسان بۆ بینەر، نەك هەر گەیاندنی (پەیام)ی خۆی بەبینەر بەڵکو جۆرە (هەژاندن و کولاندنەوە)یەکیش لەلای بینەر دروست دەکات. یاخود یەڵماز زۆرجار (لەبێ دەنگییەکدا-صمت)، قسە لەگەڵ (بینەردا) دەکات و گوزارشت (تعبیر) لەشتە پەنگخواردووەکانی ناو ناخی کۆمەڵگا دەکات.

کە هەموو ئەم دیاردانە، لێکدانەوەی قووڵی هەیەو، لەشارەزابوونی یەڵمازەوە سەریان هەڵداوە بەرامبەر شیکردنەوەیەکی زانستییانەی کۆمەڵگای کوردەواری.

هەروەها مەسەلەی (میتافۆر-مجاز) زۆر ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێ لەفیلمەکانیدا، یەڵماز لێکچواندنی زۆر بەهێزو پراوپڕی وێنەکانی کردۆتەوە بەرگی شتە ڕاستییەکاندا.

کەهەوڵ دەدەم لەماوەی هەردوو فیلمی (یوڵ و مێگەل)دا هەندێ لەو شتانەی



سەرەوەتان پێ بناسێنم.

یەکێکی تر لەشێوازەکانی یەڵماز ئەوەیە، کەزۆر ڕاست گۆیانە دێت ڕاستی کۆمەڵگای (کورد) دەخاتە ڕوو وبەخۆی دەناسێنێ، بەبێ هیچ سڵەمینەوەیەك باس لەکێشەو گرفتە (کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و ئابوری) یەکانی دەکات و هەڵوێستیهەمە لایەنەی دواکەوتوایی کۆمەڵگاکەی نیشان دەدات.

کە ئەمەش بۆ خۆی (لۆژیك)ەو، بەقوتابخانەیەکی تازە دادەنرێت، لە (کوردستان و تورکیا)دا، ئەویش قوتابخانەی (ریالیزمی کۆمەڵایەتی)یە. زۆر بەڕاشکاوی (یەڵمان) بە چەکووشێکەوە دێت و میللەتەکەی ئاگادارو هۆشیار دەکاتەوە.

کە ئەمەش بۆ خۆی نوێ خوازییەکی ترەو ئەگەر هەندێك کەسی (کۆنەپارێز)، بەشێوازێکی هەڵەی دابنێت، کە گوایە واقیعی میللەتەکەی نیشان دەوروبەرەکەی داوەو شتێکی چاکی نەکردووە. ئەوا من دەڵێم ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە ئەو کەس و لایەنانە دەیکەن، چونکە سەرکەوتوویی و (بابەتییەتی-مەوضوعی) هونەرمەند لەوکاتەدا بەدەردەکەوێت، کەبەهەموو واتایەك، ڕاست گۆبێت. هەروەها یەڵماز لەگەڵ ئەوەی بە (نەترسی)یەوە دیاردە خراپەکانی میللەتەکەی نیشان دەدات، هەرگیزیش چارەسەری لەبیرنەکردووە، هەروەك هەموو ئەو پزیشکە سەرکەوتوانەی کە زیرەکانە نەخۆشییەکان دەست نیشان دەکەن، پاشان داوودەرمانی پێویستی پێدەدەن.

دەتوانین ڕۆڵی پێشڕەوایەتی لەم مەیدانەدا بدەینە (یەڵمان) چونکە ئەو توانی (وابەستەبوونێکی دیالێکتیی یانە(ربط دیالیکتی) بکات لەنێوانی هونەرو سیاسەت و واقیعی کۆمەڵگاکەیدا.

ئەم تێکۆشانەی یەڵمازیش چووە بواری کردایەتییەوەو جێگەی گرت و ئەنجامی باشی هەبوو لە (کوردستان و تورکیا)دا. دوا سەرنجێك ئەوەیە کە هەندێ کەس، یان لەزۆربەی ڕۆژنامەو هۆکایەنی ڕاگەیاندنی جیهاندا، ناوی ئەم هونەرمەندە بەتورك و فیلمەکانی بەتورکی ناودەبەن ئەمەش لەوانەیە هەر لەبەر ئەوەبێت، کە فیلمەکانی بەزمانی تورکی دەرهێنراون، بەڵام لەڕاستیدا ئەم بیرکردنەوەو قسەیە هەڵەیە،

چونکە ڕووداوەکان-هاوارەکان بەدبەختیەکان-شوێنەکان-گۆرانی و ئاوازەکان-پۆشاك و جل و بەرگ و قاپ و قاچاغەکان- هەندێ جار قسەکانیش) کوردین و یەڵماز پڕاوپڕ ناوەرۆك و بەرگێکی کوردی پێ بەخشیون.

## باس و تێڕوانینێك لەسەر فیلمی مێگەل

suru

(مێگەل) ئەو فیلمەیە کە خەڵاتی یەکەمی فیستڤاڵی جیهانی سینەمای لە (لۆرکانۆی) سویسرا پێ بەخشرا[62]، فیلمەکە سەرەتا بەگۆرانیەکی بەسۆزو خەمناکی کوردی، لەگەڵ نیشاندانی چەند ئامێرو کەرەسەیەکی کوردی وەك (مەشکەو کونەو تەشی) و چەند پیشەیەکی وەکو (مسگەری و تەشی‌ڕێسان و تەونگەری و مەڕو ماڵاتداری) لەگەڵ وێنەی سروشتی ناوچەی (گوندی‌شێخی ڕەش)[63]، کە سیڤان ژنە نەخۆشەکەی بێریڤانی هێناوە بۆ ئەوەی نیشانی شێخی بدات، کەلەپاش مردنی منداڵی سێیەمی ئالودە بووە بەنەخۆشی (گۆنەکردن).

ڕوداوەکانی ناو فیلمی مێگەل هەمووی تراژیدیای جەرگبڕی مێژوویی میللەتی کورد نیشان دەدات، (قوربانیەکان-هاوارەکان-فرمێسکەکان-بێ دەنگیەکان-بوونی باوکی بێ‌بەزەیی ودڵ ڕەق) ئەمانە هەمووی لەمنداڵدانی فیلمی مێگەل داو بەهزرو بیری ئەو مرۆڤەی کەلەچوارچێوەی زینداندا نەخشەو پلانی بۆ کێشرابوو، هاتونەتە بوون.

## کورتەی ڕووداوەکانی فیلمی مێگەل:

دووژمنایەتی‌یەکی کۆنی تاسەر ئێسقان هەیە لەنێوان خێڵی (حالیلان) کە (نێچیرەڤان) سەرداری خێڵەو دووبرای تری هەیە (ڕاڤنی باران)، لەگەڵ خێڵی (قەیسی خانی)دا، کە (حامۆ) سەردارو سەرەك خێڵەو سێ کوڕی دی هەیە، (سیڤان) کوڕە گەورەیەو (ئەبو زەڕو سیلو) کەلەو بچوکترن[64].

وێنەی هەرە دیارو سەرەکی نیشاندانی عەقڵی‌یەتی خێڵەکی و دەشتەکی‌یە لەگەڵ پاشماوەی مانەوەی ئەو عەقڵیەتە کۆن و حوکمڕانی‌یە خوارو خێچەیە کە پێش چەند سەد ساڵ لەمەو بەر لەدنیادا لەئارادابوون، بەڵام ئەمڕۆ لە کوردستان بەشێوەیەکی زەق و کاریگەر بەرچاو دەکەوێ و گاڵتە بەچارەنووسی تاکەکانی مرۆڤی کورد دەکات.

کاتێ مرۆڤ دەکرێتە قوربانی، ئیتر هیچ جیاوازیەکی نامێنێتەوە لەگەڵ ئاژەڵدا، وابزانم یەڵماز گیونای زۆر زیرەکانە هاتووە ناونیشانێکی گونجاوی بۆ فیلمەکەی دۆزیوەتەوەو لەهەمان کاتدا وێنەی ڕانە مێگەلێکی ئاوێتەی فیلمەکە کردووە، کە هەر لەسەرەتاوە تا کۆتایی فیلمەکەش لەبەردیدەی بینەرەو شوێنەواری خۆی لەهەست و نەستی بینەردا دیاری دەکات. فیلمەکە لەلایەك گوزارشت لە خەڵکی تورکیا دەکات، کەوەك خەڵکانێکی پەرەوازەو بێ ئاگا، لەسایەی سیستەمێکی حوکمڕانی دڵ ڕەقدا، لەلایەکی ترەوە کوردستان و



خەڵکەکەی ناوی وەك و بازنەیەکی گرێدراوی ناو ئەو کێشانە نیشان دەدات.

لەکاتێکدا بەرامبەر هەردوو نیشتمانە جیاوازەکەش دوو فەرمانڕەوای جیاوازی داناوە، یەکەمیان نیشان دانی باوکی تورکانە (کمال ئەتاتورك) لەگەڵ هەموو دیمەنێکدا، وەکو ئاماژەیەك بۆ واقیعی باری سیاسی شێواوی ئەو وڵاتەو ئەو نەهامەتی و نەگبەتی‌یانەی کەبەسەر ئەو ولاتەیدا هێناوە.

دووەمیان باوکی کوردانە، کە لە(حامۆ) تەمەن هەشتا ساڵەی کەللەڕەق و قیرسیچمەدا بەرجەستە بووە ئاماژەیە بۆی.

یەکەم قوربانی‌یەك کە ڕەگەزی دیارو وێنەی بەردەوامە لەبەر چاوانی خەڵکی لە فیلمی مێگەل و هەموو فیلمەکانی تریشدا، گاڵتە کردنە بەچارەنووسی ئافرەتی کوردو تورکیش لە سایەی هەریەك لەو سیستمە فیکریانەی (سەرمایەداری کە دیارە مەبەستمان (ئافرەتانی تورکیا)یەو هەمدیسان سیستەمی (فیکری خێڵەکی)، کەلەئاکامی بەئامێر مامەڵەکردن و روانگەی بەندەی دڵسۆزەوە بەتەواوەتی عەقڵی ئافرەتیشیان خەساندووە، دیارترین و بەهێزترین نیشاندانێك لەفیلمی مێگەلدا بۆ دواکەوتووی ئافرەتی کورد، ئەو کاتەیە کە (سیڤان) بۆ جاری یەکەم و دووەم (بێریڤان) دەباتە لای پزیشك بۆ چارەسەرکردن بەڵام (بێریڤان) لەگەڵ ئەو هەموو تکاو نزای (سیڤانی) مێردیدا، هەر بوار نادات پزیشك گیانی بپشکنێ.

دیارە (بێریڤان) نمونەی ئافرەتی بێبەش و بێچارەی کوردە هەروەها قوربانی‌یەکیشە کە کراوەتە خەڵاتی خۆشکردنی خوێنڕێژی و شەڕو شۆڕی خێڵەکی و ئەو عەقڵی‌یەتە تەواو دواکەوتووە.

بێریڤانی ژیکەڵەو ڕۆح سووك ئەو کۆترە کێوی‌یەبوو، کەکرایە خۆراکی پشیلە کێویەکان و (بەچەقۆیەکی کولی ژەنگاوی ((تۆڵە سەندنەوە)) سەربڕا بەڵێ: لەوڵاتی جەنگەڵدا لەپێشەوە کۆترە بێ گوناهەکان سەردەبڕدرێن، ئەمەیە چارەنووسی وڵاتێ کە باوکەکەی ئامادەبێ هەموو شتێ بکاتە قوربانی تۆڵە سەندنەوە.

لێرەدا پێویستە ئێمە جەخت لەسەر (حامۆ)ی سەرۆك خێڵ و ڕیش سپی بکەین، کەسەرچاوەی هەموو نەهامەتیەکانە.

یەڵماز بەچاوی فەرمانڕەوایەکی نەزان ئەو ڕۆڵەی بەخشیوە بە (حامۆ)، دیارە ئەمەش ئاماژەیەکی کاڵا بەقەد باڵای میللەتەکەیەتی کەلە نەزانی و خۆخۆری و خوێن ڕشتن بەولاوە هیچ میراتێکیان لەگەورەکانەوە بۆ نەماوەتەوە.

بەڵێ سەرچاوەی قەدەرە خراپەکان هەمووی هەر لە ناوەوەی مرۆڤەکان خۆیاندا هەڵدەقوڵێن، قەدەری تاڵی ئێمەش بێ گوناه نی‌یە لەناوەوەی خۆمان.

یەڵماز زۆر بەسەلیقەوە ئەم وێنەیەی نیشانداوە، گەر هەڵوێستەیەك لەسەر ئەم چەند قسەیەی (حامۆ) بکەین، دەتوانین

کۆمەڵێك شت بەرهەم بێنین. کاتێ مێگەلەکە بەرەو ئەنقەرە بەڕێ دەخەن بۆ ئەوەی بیفرۆشن، (حامۆ) بانگی کوڕە گەورەکەی (سیڤان) دەکاتو پێی دەڵێ: وەرە گوێ ڕایەڵە بابێریڤان نەیەت، ئەو نەفرەت لێکراوە شوومە، بەد بەختی دنیامان بەسەر دێنێت، ئەگەر بێریڤان لەگەڵمان بێت، بەدبەختی بەرۆکمان بەرنادات، گشتمان دەفەوتێین... ئەم مێگەلە دوا هیوای خێڵەکەمانە ئەوە چارەنووسی ژیانمان دیاری دەکات.....[65].

باجارێ لەو شوێنەوە دەست پێبکەین، کە (بێریڤان)ی لێدەژی، ئێستە بێریڤان لەماڵە باوانی نەماوەو چووەتە ماڵێ کەپێشتر براو ئامۆزاکانیان کوشتوون، دیارە براگەلی بێریڤان دەستیان هەیە لەکوشتنی برای سیڤاندا، بەڵام سیڤان ئەوانە ناخوێنێتەوە، بەڵکو هەردوو ژنو مێردی قەدەری شەڕ بۆ یەك کردوو، ئامادەن هەتا دوا ساتەکانی ژیانیان بەیەکەوە بژین. ئەمەیە مانای ڕاستەقینەی بێ سنووری خۆشەویستی کەبێ گوناهە لەشەڕ، لەتۆڵە سەندنەوەو لەخۆگرێدان بەهەموو دابو نەریتێکی خێڵەکیو کۆمەڵایەتییەوە، بەڵێ... دەتوانین بڵێین لەژینگەکەی (حامۆ)شدا، ئەم ژینگەیە بەرچاو دەکەوێ.

حامۆ ئێستەش هەر بەچاوی دوژمنێکی سەرسەخت دەڕوانێتە (بێریڤان) چونکە لەخێڵی (حالیلان)ە، کەواتە ئیتر هەر دوژمنە، هەر نەوەیەکیش لەبێریڤان بێت، بەلای حامۆوە هەر بەدوژمن سەیر دەکرێ.

ئەمەیە ئەو خەونە ترسناکە، کەلەدەروازەی خەونی شیرینی (مرۆڤی کورد) دەبێتە کابووسێکی شەڕەنگێزو بەربینی دەگرێ، تا دوا هەناسەی لێدەبڕێ.

ئەگەر ئاوڕێك لەفۆلکلۆریش بدەینەوە، هەندێك وێنەی لەو جۆرەمان بەرچاو دەکەوێ، وەکو لەداستانە کۆنەکانی (شیرینو فەرهاد)و (مەمو زین)دا، هەندێ کەسایەتی ئەهریمەنیو شەڕەنگێز بەرچاو دەکەون جا لەوێنەی (پیرەژنێك) بێت، یان لەشێوەی (دڕکێك)دا بوونەتە کۆسپ لەڕێگەی ئەویندارانداا.

لەفیلمی مێگەلیشدا (جامۆ)ی فەرمانڕەوی خێل، ئەو ڕۆڵە دەبینێ، بەڵام لەبەرگو ڕەنگو دەنگو شێوەی هونەری واقیعداو لەشێوەی خەونو خەیالاتێکدا دەردەکەون کە بۆتە بەشێك لەژیانی مرۆڤی کورد.

کاتێکیش مرۆڤ دوور لەعەقڵو لۆژیك ژیان دەکات، ئەوا هەمیشە خۆی بەبێ تاوان دەزانێو هەموو تاوانەکان دەداتە پاڵ خەڵکی تر. ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە (حامۆ)ی حوکمڕانی خێڵو بنەماڵەیە.

ئەمەیە کە دەڵێین لەچوارچێوەی ئەو سیستەمە فیکریو کۆمەڵایەتییەدا هیچ بەهایەك نادۆزرێتەوە بۆ مرۆڤەکان.

ئەمانەش هەموو لەتێڕامانی یەڵمازەوە سەریان هەڵداوەو هاتووە (خانەیەکی) حوکمڕانی لەجەستەی وڵاتێکی پەرەوازەو پەرت بوو نیشان داوە.

ئەگەر تاوێك لەسەر بڕگەی کۆتایی قسەکەی حامۆ ڕابوەستین واتە (ئەم مێگەلە دوا هیوای خێڵەکەمان دیاری دەکات)[66].

ئەوا گەوهەری پرۆسەی ئابووریمان بۆ ڕوون دەبێتەوە لەباکوریکوردستاندا کە چۆنو بەچ شێوازێکی بەرهەم هێنان بەڕێوەدەچێ.

یەڵماز گیونای لەڕێگەی سینەماوە توانی کێشمە کێشەکانی (سیاسی-ئابووری-ئایدۆلۆژی) بخاتە ڕوو[67].

ئەوەی مەبەستی سەرەکی ئێمەیە لێرەدا بەدیار خستنی پرۆسەی ئابورییە کە بۆ خۆیشی لەدوایدا گەوهەری پرۆسەی سیاسی لەئامێزدەگرێت.

دەکرێ بڵێین لەتورکیادا کە بۆرژوازییەت تاڕادەیەك پێگەیشتووە بەهۆی گەشەی پیشەسازیو بەگەڕخستنی کارگەی گەورەو ئامێری تازەی بەرهەم هێنانەوە، وێڕای ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیو شوێنە جوگرافییەی کەلەگەڵ ئەوروپادا هەیەتی، بەڵام لەبەشی کوردستانەکەیدا هیچ گرنگییەك نەدراوە بۆ بەگەڕ خستنی بزووتنەوەی ئابووریو چالاکی ڕووناکبیری، جگە لەهەندێ کارکردنی کەم نەبێ لەسەر خەڵکی باکوری کوردستان، ئەویش بەهۆی هاتووچۆی خەڵکی کوردستانەوەیە بۆ شارە گەورەکانی (تورکیا)، ئەمە وایکردووە کە خەڵکی کوردستان لەتورکیاداهەر لەسەر پاشماوەی هۆیە کۆنەکانی بەرهەمهێنان بمێننەوە. دیارە مەسەلەی ئابووریش وەکو پێشتر زانایان باسیان لێکردووە گەوهەری بناغەی پەیوەندیەکانی تاكو خێزانو خێڵو دەوڵەت پێك دەهێنێت، بۆیە مەسەلەی ئابوری بەئامرازو شێوازو پەیوەندییەکانیشییەوە، بووەتە کۆسپێکی گەورە لەبەردەم پرۆسەی بەردەوام بوونی ژیانێکی دامەزراو لە کوردستاندا.

هەروەك لەوتارێکی (میشێل فۆکۆ)دا بەناونیشانی (هونەری حوکمڕانیکردن لەچی پێك دێت؟)، لەباسی حوکمڕانیکردندا، زنجیرە دەقێکی پەروەردەکاری (لۆڤایەر) بەنموونە دەهێنێتەوە کە دەڵێ: لەبناغەوە سێ نموونەی حکومەت هەیە کە هەریەکەیان لەسەر شێوەیەك لەزانستیو بیرکردنەوەیتایبەت دادەمەزرێت: حکومەتی خود کە لەسەر ڕەوشت دادەمەزرێت، دووەم هونەری حوکم کردنی خێزانێك بەشێوەیەکی ڕێكو پێك کەلەسەر (ئابوری)دا دەمەزرێت، دووا ییشیان حوکم کردنی وڵاتە بەشێوەیەکی ڕێكوپێك کەلەسەر سیاسەت دادەمەزرێت، پاشان هەر خۆی واتە (فۆکۆ) دەڵێت: هەر ئەم حوکمەتەی خێزانە کەبەڕاستی ناوی (ئابووری) لێ دەنێین.

هەر لەزنجیرە وتارەکەیدا، نموونەی وتاری (ئابوری سیاسی) یەکەی (ژان ژاك ڕۆسۆ) دەهێنێتەوە کە دەڵێ: وشەی ئابووریبەشێوەیەکی بناغەیی ئاماژەکردنە بۆ حکومەتێکی حەکیمانەی خێزان، لەپێناو خێری هاوبەشی هەمووئەندامانی خێزان[68].

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە ئەو پێناسانەی کەبەسەر حکومەتی خودو حکومەتی خێزانو حکومڕانی کردنی ولاتدا دەچەسپێ، دەبێ چ پێناسەیەك بۆ حکومەتی (خود)ی کوردو حکومەتی (خێزانی) کوردو (حکومەتی بالآی) کورد، کەمەبەستمان (دەوڵەتی کوردە)و سەرجەم حوکمڕانەکانیان لەچوار چێوەی فیلمی مێگەلدا بدۆزینەوە؟!...

بێ گومان تاکی کوردی بەنێرو مێیەوە، بەتاکێکی بێئیرادەو پرزەڵێ بڕاوی بێبڕیار، مل کەچو سەرشۆڕی دەسەڵاتە باڵاکەیسەروو خۆیەتی، ئەویش دەسەڵاتی حکومەتی خێزانە، کە وەکو پێشتر باسی لێکرا لەسەر بناغەی (ئابوری) دادەمەزرێت.

کەواتە تاکەکانی ئێمە چاو لەدەستی سەرچاوە ئابوورییەکانی حکومەتێکن کە خۆی لەخۆیداحکومەتێکی وێرانو داڕماوە، ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەل دنیای پێشکەوتنی شێوازی بەرهەم هێنانو گۆڕانە کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو فەرهەنگییەکانی شارستانییەتی جیهان، کەبێ گومان گۆڕانو

گەشەسەندنی (ئەوان) واتە میللەتانی دنیا، لەبنیادنان و گەشەی تاکەکانیان و پاشان خێزانەکانیان، کەپێشتر ناوی هەریەکەیانمان بەحوکمەتی سەربەخۆ برد لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەی کەزانایان بۆیان دانـاون، پێکهاتووە بۆ حوکمڕانی کردنێکی ڕێکوپێکی وولات.

ئەگەر سەنجی فیلمەکە بدەین، لەوکاتەی (مێگەلەکە دەبەنە ئەنقەرەو سیڤان بێریڤان-ی هاوسەری لەماڵە هاوڕێیەکی دادەنێ، بۆ ئەوەی بچێ هەندێ پارە لەباوکی وەربگرێ تاکو بێریڤان نیشانی پزیشک بدات و ماوەیەکیش پێی بگوزەرێنن، لەوکاتەدا (حامۆ) بەتوندی دەچێ بەگژیداو بڕە پارەیەکی کەمی لەشێوەی سوالّ کردندا پێ دەدات، سیڤانیش لەنائومێدی و ناچاریدا لێی وەردەگرێ.

ئەمە وێنەی ئەو ڕاستیەمان نیشان دەدات، کە حکومەتی خودو حکومەتی خێزانی کورد تیا دەژین، هەر وەك چۆن فیلمەکەش بەتراژیدیایەکی خەماوی کۆتایی دێت، کاتێك (بێریڤان) لەچاوەکسەکەی یارمەتیدانی خەزوورو چاوەڕوانییەکی بێزاردا، چاوە شەرمنەکانی لێك دەنێت بۆ هەتا هەتایی.

بەڵێ: ... یەڵماززۆر ڕاستی کردووە، کەوتوویەتی (ئەم فیلمە دەبێتە مێژوویەك بۆ گەلی کورد)[69].

دیارە یەڵماز باس لەبارودۆخی (ئێستا)ی میللەتەکەی دەکات، کەئەم مێژووەی لێدەکەوێتەوە: بیریڤان هەر بەبێ دەنگی و زمان بەسراوی و دوور لەماڵی خۆی و بێلانە دەمرێت، کەسێ نییە لاشەکەشی بشارێتەوە، سیڤان دەگیرێت، (سیلۆ)ی نامۆ بەدنیای شارستانیەت و شەقامی پاك و تەمیزو کۆشکی ڕەنگاو ڕەنگ، هەر لەناو دڵی تورکیادا (ئەنقەرە) خۆی لەبابی دەدزێتەوەو دیار نامێنێت.

بابیشی (حامۆ)بێ کەس و بێ ئیرادەو نامۆ، یەك بەخۆی لەشەقامەکانی ئەنقەرە هاوار دەکاو کەسیش نییە وەڵامی بداتەوە.

مێگەلەکەش، ئەوەی دەمرێ، دەمرێ و ئەوەی دەدزرێ، دەدزرێ و ئەویشی دەمێنێتەوە، تالان فرۆش دەکرێ.

بەراوردەکەش بۆ خۆتان بەجێ دێڵم............

بێ دەنگی دەریای ئارامی دەشڵەقێنێت:

ئەگەر بەووردی لەفیلمەکانی یەڵماز بروانین، بەتایبەتی فیلمی (مێگەل)، ئەوا بەئاشکرا یەکێك لەسیما دیارەکانمان دێتە پێش چاو، کەپەیوەندییەکی (ئامـاژە بۆکراومان) بۆ دروست دەبێت.

یەڵماز خۆی بەشێك بوو لە گەلێکی ماندوو بە (فیکر-بەجەستە-بەڕۆح) مرۆڤیش کاتێك ماندوویێتی تەنگی پێ هەڵدەچنێ هەوڵ دەدات کەمترین قسە بکات، بۆیە پێویستی بەوە دەبێت زمانێکی دی هەڵبژێرێ.

لێرەدا پرسیارێك خۆی دەخاتە ڕوو، ئەویش ئەوەیە:

ئایا زمان لەخۆیەوە دروست دەبێ؟ یان پێویستییەکی ژیاری و خودی و بابەتی زمان دروست دەکات ؟

لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین زمانی (بێدەنگی)، خەریکە دەبێتە زمانی ڕەسمی (تاکی کورد)، بەهۆی بارودۆخی ناهەموارو ئەو پێداویستییە یەك لەدوای یەکە مرۆییە سەرەتاییانەی کە (تاکی کورد-فردی کردی) ڕۆژانە دەستەوەستان و بێ توانایە، لەبێ وەڵامیاندا.

لەمێگەلدا، هەر لەسەرەتای فیلمەکەوە هەتا کۆتایی (بێریڤان لەبێدەنگییەکی خامۆش ئامێزدا دەژی، هەرچەندە سیڤانی هاوسەری تکاو نزای دنیای تیا دەکات کەتاکە قسەیەك بکات، تەنانەت داوای لێدەکات کە جنێوێکیشی پێبدات، بەڵام (بێریڤان) هەرلەبێدەنگیدا دەژی.

کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا ئاماژەیەکی ترە بۆ بێ ئیرادەیی ئافرەتی کورد. بۆیە ئەم هەموو بێ توانایی و فشارە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕۆحییانەی سیڤان کەئەویش نموونەی پیاوی بێ ئیرادەو زۆرلێکراوی کوردە دەریای ئارامی دەشڵەقێنێ و تووڕەیی خۆی بەسەر جەستەو گیانێکی پاکیزەدا بەتاڵ دەکاتەوەو پاشانیش بەلەئامێزگرتن و ماچ کردن وەفاداری خۆی پێ ڕادەگەیەنێ.

ئەمەش وێنەیەکی تری زیندووە کە لە فیلمەکەدا بەدی دەکرێ و دەتوانین بەلایەنێکی تری گرنگی (زمانی هونەری) یەڵمازی دابنێین، کە بەڕوونیش لە فیلمی ((ڕێگا-یۆڵ)دا هەمان بێ ئیرادەیی و بێ توانایی مرۆڤەکان بەدی دەکرێ.

## باس و تێڕوانێك لەسەر فیلمی (یۆڵ-ڕێگا):

یۆڵ، ئەو فیلمەیە لەساڵی 1982داو لەفیستڤاڵی ساڵانەی (کان)ی سینەماییدا، خەڵاتی یەکەم و چڵەخورمای زێڕینی وەرگرت.

لەڕاستیدا فیلمەکە، کۆمەڵێك تەوەری سەرەکی لەخۆگرتووە، کە هەریەکەیان ڕەنگدانەوەی واقیعی باری (سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی)یە، لە کوردستان و تورکیا)دا کە ئیلهامی حوکمڕانییەتی(لەکۆمەڵێك ژەنەراڵی سەربازی وەردەگرن).

یەڵماز، لەچوارچێوەی زیندان دابوو کەسیناریۆی فیلمەکەی نووسی و بەهاوکاری هەڤاڵانی (ناوزیندانی و دەرەوەی زیندانیشی) بەئاکامی گەیاند.

لەکاتێکدا دەرکردنی ئەم فیلمە لەبارودۆخی نالەباری وەکو ئەو بارودۆخەی یەڵماز ژیانی تێدا دەکرد شتێکی ئێجگار گران بوو، چونکە فیلمەکە بەزەقی شۆڕشێکە لەدژی هێزی کۆنەپەرستی تورك و لەگەڵ ئەوەشدا بابەتی فیلمەکە بزاوتنی زۆری گەرەك بوو، مەشهەدەکان لەناو پاسدا، لەناو شەمەندەفەردا، لەڕنووی بەفری (چیای بنگول)ەوە تا سنووری سووریا، لەم سەری وڵاتەوە بۆ ئەوسەری[70].

ڕەنگە بەجێ گەیاندنی کارێکی ئاوا گەورە، هەر لەمرۆڤێکی خاوەن ورەو پۆڵایینی وەکو یەڵماز بوەشێتەوە، کاتێ گۆڤاری (دێرشپیگل) لێی پرسی چۆن چۆنی توانرا فیلمێکی وەك (یۆڵ) لەپێش چاوی زەقی ڕژێمدا بەرهەم بهێنرێ؟

یەڵماز گوتی: (توانرا، چونکە ڕێگەم بەنووچ دان نەدا، لەبارودۆخێکدا هەتا ڕێژسیۆرە ئازادەکان کۆڵیان داو لەبەردەم (کۆسپ) بەچۆکداهاتن، بەلامنەوە مەسەلەی ژیان بوو، پێویستییەکی مانەوە بوو تا بەئیسپاتی بگەیەنم پیاو هەر دەتوانێ کاربکا، خەبات بکاو سەریش بکەوێت[71].

دەرهێنانی فیلمەکە لەلایەن (شریف گۆرەن)ەوە بوو، بەڵام یەڵماز هەر لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی و بگرە لەناو زیندانیشەوە، سەرپەرشتیاری تەواوی کرد، ئەوەبوو پاش دەرۆژ کارکردن، ریژسیۆری

یەکەمی گۆڕی، چونکە یەڵماز بەردەوام هەواڵی وێنەو مەشهەدەکانی پیَ دەگەیشت هێندە قاڵ بوو بوو، بتوانیَ بڕیارێکی بەو جۆرە بدات، ڕاستە بڕیارێکی ئاسان نەبوو، بەڵام بڕیارێکی پێویست بوو.

چونکە ریژسیۆری یەکەم تواناو لێهاتوویی‌یەکی وای نەبوو خواستەکانی یەڵماز ڕەنگ پیَ بداتەوە[72].

کاتێکیش وێنە گیرانی فیلمەکە تەواو بوو، یەڵماز دڵنیابوو لەوەی گەیشتۆتە دەرەوەی وڵات، ئیتر یەڵماز خۆیشی بەیەکجارەکی تورکیای بەجیَ هێڵاو توانی خۆی سەرپەرشتی مۆنتاژو شتنەوەی بکات، بەشێکی لە پاریس‌و بەشێکی لە سویسرا بەرهەم هێنا، یەڵماز خۆی دەڵیَ: ڕەنجێکی زۆرم دا، هەموو ڕێگەیەکم گرتە بەر، تا ئەو فیلمە بەبەرهەم بێت[73].

دیارترین‌و ئاشکراترین لایەنێك کە لەفیلمی (یۆڵ -ریَگا)دا ئاماژەی بۆ کراوە، مەسەلەی نەبوونی (ئازادی)یە، لەچوارچێوەی حوکمڕانی‌یەتی دەوڵەتی تورکیادا، کەئەمەش لەبەئاگایی‌و هۆشیاری‌یە سیاسی‌و هونەری‌یەکەی یەڵمازەوە سەریان هەڵداوە، کاتێك بەگوێرەی زنجیرەیەکی ڕێك‌و پێك‌و بابەتی‌یانە هەڵساوە بەڕێکخستنی ڕووداوەکانی فیلمەکە.

ڕووداوەکانی بەشێوەیەکی زیرەکانە نیشانداوە، بەشێوەیەك کە هەموو مەسەلە بنەڕەتیەکان‌و ئەو بیَ ئاکامی‌یەی کە (کەسەکانی) ناوفیلمەکە تووشی دەبن دەگێڕێتەوە بۆ بارودۆخێکی (سیاسی دژوار)، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی زۆری وێنەو لەقتەکانی فیلمەکە (وێنەو لەقتەی ڕاستین)، مەشهەدی ژەندرمەکان لەو لەقتە خوێناوی‌یەی گوندەکەدا ڕووداوێکی ڕاستی‌یە، فەرماندەکەیان زۆر شانازی بەوتاوانکاریەیان، دەکات کە وێنەی خۆی‌و پیاوەکانی بکرێتە فیلم[74].

هەروەها یەڵماز توانیوویەتی بەکەمترین هۆو ئامێری بەکارهێنان، زۆرترین شت نیشان بدات لەفیلمەکەیدا.

ڕەنگە یەکێك لەنهێنی سەرکەوتنەکانی یەڵماز گیونای) لە فیلمی (ڕێگادا)و سەرجەم فیلمەکانی تریشدا، ئەو (ژینگە)یە بێت، کە یەڵماز ژیانی تێدا کردووە. تەنها مرۆڤی برسی دەزانیَ کە قەدری نان چیەو مرۆڤی بەندو یەخسیریش دەزانیَ نرخی ئازادی‌و سەربەستی چی‌یە. خەمێکی هەرە سەرەکی یەڵماز -ئازادی بوو، کە زۆر بە ئاشکرا لەفیلمەکەدا دەبینرێت، من پێم وایە کە بەشێك لەسەرکەوتویی (هونەرمەندی ڕاستەقینە) لەوەدایە کە زۆر لەخۆکردن(تصنع) بەکارەکانی‌یەوە دیارنەبێت هەروەها سەرچاوەی ئیش‌و کارەکانی بەشێك بووبن لەسەر چاوەی ئێش‌و ئازارەکانی‌و ئەو شتانەی کە باسیان لێدەکات‌و وێنەیان دەگرێت (جاوێنەی فۆتۆگرافی بێت یان وێنەی کامێرای چاوو هزرو بیر) بێت، گرنگ ئەوەیە بەشێك بووبن لەژیانی، کە ئەم قسەیەش بەسەر ئەدەب‌و



سیاسەت‌و تاڕادەیەکی زۆریش لایەنەکانی تری ڕۆشنبیریدا دەچەسپیَ.

با زۆر دوورنەکەوینەوە لەباسە سەرەکی‌یەکەو جەخت لە (ئازادی) بکەین لە فیلمی (ڕێگا)دا، زیندان بوو بووە بەشێکی گەورەی ژیانی یەڵماز زۆربەی زۆری ژیانی لە زینداندا بەسەر بردبوو، کە بوونە کەرەسەی ئەم فیلمەو زۆربەی زۆری فیلمەکانی تریشی، دیارە بۆ پیاوی هۆشیار، سەرەداوێك زۆرە بۆ ئەوەی (قاڵی)یەکی ڕەنگین‌و پڕ نەخش‌و نیگاری لێدروست بکات.

یەڵماز دەیەوێت لە فیلمی (ڕێگا-یۆڵ)دا چی بڵێت؟!...

وەکو خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ یەکێ لە گۆڤارە (فەرەنسی)یەکاندا، سەبارەت بەفیلمی (ڕێگا) پێمان دەڵێت:

(من ئەمەویَ لە فیلمی ڕێگادا بڵێم کە تورکیا زیندانێکی گەورەیە، کە هەموو خەڵکەکەی لەناوادەژین ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمیان-سیستەمی سیاسی ئەو وڵاتە.

دووەم- مانەوەی پاشماوەی چەرخەکانی ناوەڕاستە لە تورکیادا، بەتایبەتی پەیوەندی نێوان (ژن‌و پیاو)، کە پیاویش لەبازنەیەکی بەیەك گەیشتووی (حلقة الوصل)ی ئەو سیستەمە دەخوولێتەوەو هەموو (تواناکانیان) لە (دواکەوتنیان)ەوە وەردەگرن[75].

**کورتەی ڕووداوەکانی فیلمەکە ئەمەیە:**

(پێنج) مرۆڤی بەندکراو لەیەکێك لەزیندانە (نیوەکراوەکاندا)* فەرمانی مۆڵەتێکی‌چەند ڕۆژەیان پێدەدریَ بۆ ئەوەی سەردانێکی کاتی ماڵەوەیان بکەن کە هەریەکەیان خەڵکی ناوچەیەکی جیایەو هەریەکە لەرێگا تووشی کۆمەڵێك کۆسپ‌و تەگەرەو بیَ ئاکامی دەبێت:

یەکێك لەو زیندانی‌یانە (سید عەلی)یە، کە هونەرمەند طارق ئاکان[76] ڕۆڵی ئەکتەری نواندووەو ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە فیلمەکەدا.

کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە لە شاری (قۆتیە) سەیر دەکات خێزانەکەی (زینە) کە هونەرمەند (شریف سیزر)[77] ڕۆڵی ئەکتەری نواندووە، دڵی داوە بەکەسێکی تر، (سەید عەلی) یەکسەر ڕوودەکاتە ماڵی خەزووری، کەلەیەکێك لە گوندەکانی باکوری کوردستانەو ناوچەیەکی بەفراوی‌یە.کە دەچێتە ماڵی خەزووری، سەیر دەکات ئەوەتا ماڵی خەزووری لای خۆیان گلیان داوەتەوە تاوەکو (سەید) دێتەوەو بڕیاری خۆی لەسەر دەدات، (زینە) بەبینینی سەید داوای لێبوردن دەکات‌و پەشیمانی خۆی دەردەبڕیَ. دیارترین وێنەیەك کەسەرنجی بینەر ڕابکێشیَ لێرەوە دەست پیَ‌دەکات، کاتێك (سەید عەلی) بڕیاری گەڕانەوە دەدات بۆ ماڵی خۆی لەگەڵ (زینە)و (میرزا)ی

کوردیــــدا، بـــەڵام لەڕاســـتیدا بڕیـــاری (نەگەڕانەوە) بوو، چونکە (سەید) دڵنیا بوو لەوەی کە زینەی ژنی بەو ڕێگە پڕ لە بەفرو سەختو هەڵدێرە هەرگیز ناتوانێت ئەو ڕێگەیە ببڕێت، بەڵام خۆ چاری ناچارەو بڕیاریش هەر بڕیاری مێردەکەیەتی کەتەنها ئەو بۆی هەیە ژیانو چارەنووسی دیاری بکات.

لە فیلمی (مێگەل)دا باسمان لەبێ ئیرادەیی (ئافرەت) کرد لەبەر ڕۆشنایی فیلمەکە، لە فیلمی (ڕێگا)شدا هەمان وێنەی ئەو بێ بڕیاریو بێ ئیرادەیە بەرچاو دەکەوێ، ڕەنگە بەهێز ترین (ئیحا)یەك لەفیلمەکەدا کە هەستو هۆشی بینەر ببزوێنێ و (زاکیرە)ی مرۆڤی کورد بکولێنێتەوە، ئەو لەقتەیە بێت کە (زینە) لەتاو ماندوو بوونی ڕێگەو ساردی بێ‌شوماری ئەو بەستەڵەکەی کەپێ‌ی‌دا ڕێدەکەن، دەکڕوزێتەوەو هاواری دەکات بۆ سەیدی هاوسەری کە زۆر بەڕوونی ئەو پەڕی بێ‌توانایی‌و ترۆپکی دەستبەردان لە ژیانی پێوە دیارە، کاتێکیش کە سەید دەگەڕێتەوە سەری بەسەر جەستەیەکی بێ گیاندا دەکەوێ هەرچەندە هەوڵێکی زۆر دەدات بەلێدانی جەستەکەی کە جارێکی تر جووڵە بکەوێتەوە خوێنی بەستووی، بەڵام بێ سوودە، بۆیە (سەید)یش بەهاوارێکی هەژێنەر گوزارشت لەپەشیمان بوونەوەی دەکاتو دەیکاتە کوڵی، ئەمەیە نیشاندانی ئەو بەدبەختی‌و بێ چارەیی‌یە کەمرۆڤی کورد تووشی هاتووە، لەساتێکدا بڕیاری کوشتن‌و لەساتێکیشدا پەشیمان بوونەوەیەکی تراژیدی ئامێز کە (دوولایەنی دژەیەك) لە کەسایەتی (مرۆڤی کورد)دا نیشان دەدات هەمیشەو بەردەوامیش ئەم حاڵەتە لەکەسایەتی مرۆڤی کورددا بەدی دەکرێت.

ڕەنگە پەڵماز لێرەدا بیەوێت بڵێت، ئەگەر ئافرەتی کورد بە فیشەك تۆڵەی لێنەکرێتەوە ئەوا دەکرێتە (خۆراکی بەفر)، ئەگەر نەشکرێتە خۆراکی بەفر بە چەقۆی ژەنگاوی داب‌و نەریتی کۆنی کۆمەڵایەتی سەردەبڕدرێ.

یەکێکی تر لەزیندانی‌یەکان (محمد صالح)ە، کە (خەلیل ئارکۆن)[78] ڕۆڵی تیا دەبینێ، ئەمیش بەڕێ دەکەوێ بۆ شاری (دیاربکر)و پاشان ئەمیش لەسەر دەستی



ژن براکەی دەکوژرێ، چونکە لەگەڵ یەکێ لەژن براکانی تریدا هەوڵی دزی کردن دەدەن، بەڵام ئەم ڕادەکاو ئەو دەکوژرێ، کاتێ ماڵی خەزووری بەمەسەلەکە دەزانن ڕقەکەیان ئەوەندەی تر خەست دەبێتەوە، بۆیە کاتێك دەیانەوێ (خۆی‌و خێزانەکەی) بگەڕێنەوەو دەرچنە ناو شەمەندەفەرەکەوە، هەردووکیان دەکوژرێن.

لەهەموو ساتو ڕووداوو لەقتەیەکی فیلمەکەدا (پەشیمانی) دەبێتە ئاکامی کەسێتی‌یەکان، (بەڵێ... لەهەموو ساتێکدا، بێ وەڵامی... بێ وەڵامی) ئەو زەنگەیە کە لەدەرگای مرۆڤی (کورد) دەدات، ڕەنگە پەشیمانی بووبێتە ئەو قوتابخانەیەی کە وانەی ئەو پرسیارەی تێدا بخوێنرێ کە هیچ وەڵامێکی تێدا دەست ناکەوێ، چاکتروایە بڵێین مەملەکەتی بێ وەڵامەکان...

ئەمەش بەسەرهاتی یەکێکی ترەلەو زیندانی‌یانەی کە خەڵکی گوندێکی کوردستانەو ناوی (عومەر)ە، کە (نجم الدین چۆبان ئۆغلو)[79] ڕۆڵی تیا دەبینێ، کاتێك لەسەر شاشەی (کوردستان) دەبینرێ (عومەر) دادەنەوێتەوە بۆ خاکەکەو ماچی دەکات، گوندەکە لەقوڕ دروست کراوەو دووروونزیك دەنگی تەقە بەرگوێ دەکەوێ، (عومەر) کچێکی گوندەکەی خۆش دەوێ کەناوی (گوڵ بەهارە)و (سەمرا ئۆجار)[80]، ڕۆڵی ئەکتەری تیا دەبینێ.

بەڵام عومەر پەشیمان دەبێتەوە لەخواستنی گوڵ بەهار چونکە دەڵێ: من ناتوانم ژن بهێنم چونکە ژنەکەم بێوەژن دەکەوێت[81].

یەکێکی تر لەزیندانیەکان ناوی (یوسف)ە، تۆنجای ئەقچا[82]، ئەو ڕۆڵە دەبینێ، ناتوانێ ماوەی مۆڵەتەکەی تەواو بکاتو لەڕێگە دەیگرنەوە، چونکە پسوڵەی مۆڵەتەکەی لێون دەبێت.

یەکێکی تر لەزیندانیەکان ناوی (مەولودە)، کە (حیکمەت جەلیل)(83) ڕۆڵی ئەکتەری تیا دەبینێ، ئەمیش ناتوانێت بۆ ساتێکی کورتیش لەگەڵ ئەو دەزگیرانەی دابێت کە جێگایەکی گەورەی لەخەون‌و خەیاڵەکانی داگیرکردووە، بەهۆی داب‌و نەریتی دواکەوتووی ئەو ناوچەیە کەشارێکی تورکی‌یە (عنتاب).

بەکورتی ئەمەبوو ڕووداوەکانی فیلمی (ڕێگا) کەلێکچواندنێکی زۆری هەیە لەگەڵ فیلمی (مێگەل)دا، چونکە هەریەکەیان بەزمانێکی جیاوازو وێنەی جیاوازو بەڵام بەیەك ئاراستەو بۆچوون، گوزارشت لەخەڵکی تورکیاو کوردستان دەکەن.

لـه ڕێگاشـدا، خەونـەکان ، کۆچـەکان، کڕوزانەوەو هاوارو فرمێسکەکان) نموونەی هـەمان خـەونو خـەیاڵو کۆچـی پـڕ لەمەینەتیو ئازارو کڕوزانەوەو هاوارو ناڵەو فرمێسکی خەڵکی کوردستانە، مرۆڤی نا ئازاد ئەگەر لەچوارچێوەی بەندیخانەیەکی ڕاستەقینەشدا نەبێت، هەر زیندانییە، یەڵماز دەیەوێت ئەوە بڵێتو ئەوە نیشان بدات کە مرۆڤی کورد ئازادنییە لەڕوی فکرەوە، لەڕووی کەسێتییەوە، لەپەیوەندی یەکۆمەڵایەتییەکانیدا لەسەروی هەمووشیانەوە، ستەمی میللیو چەوساندنەوەی چینایەتی، بەڵام بەشێوەیەکی ئێستاتیکیو هونەری بالآو سەرکەوتووانە.

لەکۆتاییدا دەتوانم بڵێم گۆڤاری (الهدف)ی فەلەستینی ڕاستی کردووە، ناوی فیلمی یۆڵی بە (ئەلیازەی تورکی)[84] بردووە، بەڵام لەڕاستیدا دەبوایە بیگوتایە (ئەلیازەی کوردی–تورکی)

**بەرهەمە ئەدەبیەکانی (یەڵماز گیونای):**

یەڵماز هەروەك چۆن لەبواری سینەمادا ناوبانگی چاکی هەبوو، بەهەمان شێوە لەبواری ئەدەبیاتیشدا خاوەن قەڵەمێکی ڕەنگینو هزرو بیرێکی ڕۆشن بوو.

یەڵماز سەرەتا بەهرە ئەدەبییەکانی خۆی بەکورتە چیرۆك نیشان دا، ئەوەبوو یەکەم کورتە چیرۆکی لەڕۆژنامەی (بیرگوین–Birgun) لەساڵی 1952 بڵاوکردەوە.

دیارە ئەمە سەرەتایەکی زۆر چاكو بەهێز بوو، هەر لەبەر ئەمەش بوو لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە حسابێکی زۆری بۆ کراو تووشی گێرمەو کێشەبوو، وەکو لەژیانەکەیدا باسمان کرد.

هەروەها یەڵماز کۆمەڵێك ڕۆمانی هەیە ناوبانگی یەڵمازیان بەجیهاندا بڵاوکردەوە، لەوانە (صالبا)یە کە کاتی خۆی هەڵبژێردرا بۆ پاداشتی (نۆبڵ)[85].

هەروەها ڕۆمانێکی تری هەیە کە لەساڵی (1961)دا لەزیندان نووسیویەتی بەناوی (ئەوان بەکەساسیو مل کەچی مردن– Boynu Bukuk Olduler) ئەم ڕۆمانەش لە ساڵی 1972دا توانی خەڵاتی ئۆرهان کمال بەدەست بێنێت[86].

یەڵماز ڕۆمانێکی تری بەناوی (ئێمە کورەیەکمان ئەوێت، یەك پەنجەرەو دوو نان) هەیە، ئەم ڕۆمانەی یەڵماز بەگەشەی فیکریو ئایدۆلۆژی دادەنرێت بۆ ئەو سەردەمەی، کاتێك لەپەنجا لاپەڕەکانی کۆتاییدا، هاتووەتە سەرباسی (سۆسیال ئیمپریالیست)و ڕەخنە گرتن لە سیستەمی ڕووسیای شورەوی لەکاتێکدا لەناو ئەو نووسەرانەی کە باسەکانیان مۆرکی ناوەرۆکی کۆمەڵایەتی پیوە دیاربوون



کاریکی ئاسایی نەبوو کەهەلویست وەربگرن دژی روسیای شورەوی[87].

هەروەها لە ڕۆمانەکانی تری (زیندانەکانم)و (تاوانبار)*ە. یەلماز کتیبیکی تری نووسیوە بەناوی (هەندیك نامە لەسەلیمی)یەوە، ئەم کتیبە بریتییە لەسێ چیرۆکی بەرز، کە یەلماز رەخنەی توند لەو کەسانە دەگریت کەلەو کاتەدا لەزیندانەکاندا دەگیران هەلویستی تەسلیمکارانەیان نیشان دەداو پەشیمان دەبوونەوە لە هەلویستی شۆرشگیرانەیان(88).

هەر لەوماوەیەدا، چەندین وتاری سیاسیو نامەی بۆ کەسایەتی جیهانی نوسیوەو لەسالی 1979شدا گۆڤاریکی سیاسیمانگانەی دەرکرد بەناوی گۆنەی کە هەژدە ژماری لیدەرچوو، ئیتر قەدەغەیان کرد. هەروەها لەگەڵ کۆمەلیك هاورێیدا دوو گۆڤاریان دەرکرد بەناوی (ورك–بوران) ئەویش بەردەوامی نەخایاندو هەرزوو دایانخست(89).

یەلماز گیونای لەچوارچیوەی هونەری ئەدەبیشدا، (مندالی کوردی) لەبیرنەچووەو لەناو (ئەدەبی منداڵ)دا جیدەستی دیارە، لەکاتیکدا میللەتی کورد زۆر هەژارە لە (ئەدەبی منالاندا)، من دەمەویت لەم بەشەی باسەکەمدا جەخت لەسەر ئەو کۆمەلە (کورتە چیرۆکانە) بکەم کە (یەلماز گیونای) بۆ مندالانی نووسیوە لەژیر ناونیشانی (فاشیزم چییە)؟ کە ئەم ناونیشانە یەکەم کورتە چیرۆکی ناو چیرۆکەکانە.

یەلماز زۆر شارەزایانە لەبواری پەروەردەکردنی منالانو سایکۆلۆژیەتیانو خواستەکانیان توانیویەتی شتیان بۆ بنووسێ.

کورتە چیرۆکەکان ئەمانەن: (1/فاشیزم چییە؟، 2/ناچار، 3/گالتە..درۆ، 4/دووهیلکە مریشك.، 5/واهیمە، 6/دووژمنەکەت فەرامۆش مەکە، 7/عەرەبانەی دارین، 8/کورم لەژیانا تەماشاکەر مەبە، 9/من شۆرشم ناوێ..هەلوژەم ئەوێ، 10/ئەگەر شەر نەبی ئاشتیش نابێ، 11/ناوکەشیلانە، 12/فریونەخۆی)(90).

ئەم کورتە چیرۆکانە بریتین لەکۆمەلیك ئامۆژگاری بەنرخو گرنگ بۆ مندالانو یەلماز گیونای لەم کورتە چیرۆکانەدا، پەیوەندیە کۆمەلایەتییەکانی تورکیاو کیشە چینایەتیەکانو ژیانی مندالانی کریکارو بۆرژواکانی بەشیوازیکی سادەو ئاسان، خستۆتە بەر دیدەی مندالانی ولاتەکەی. هەروەها کیشەو تەنگژە کۆمەلایەتیو سایکۆلۆژییەکانی مندالانی بەوینەیەکی ئەدەبی رەنگین نوسیوەو چارەسەری بۆ ئەو کیشانەش دۆزیوەتەوەو ئامۆژگاری مندالان دەکات کە رازی نەبن بەو واقیعەی سەپینراوە بەسەریانداو هانیان

دەدات، بۆ ئەوەی بیریکەنەوە لە ئایندەی خۆیان. دیارە لە نووسینی ئەم کورتە چیرۆکانەدا، یەلماز دەیەویت تۆوی (هیوا-ئومید-شۆرش-ماندوونەبوون-فریونەخواردن) لەلای منداڵانی ولاتەکەی بچینێ، بەدەر لەو رەوشتە خواروخیچە ناپەسەندەی کە کۆمەلگا سەپاندوویەتی، هاوشان لەگەڵ ئەو سیستەمانەدا کە کۆمەلگاکەی بەریوە دەبەن، یەلماز دەیەویت هەنگاویکی خیرا بەسەر هەموو ئەو شتانەدا بنێ کە خۆی پییان رازی نەبوو، ئەگەر لەرووی ناوەرۆکەوە سەرنجیکی ورد لە کورتە چیرۆکەکان بدەین، تیرامانیکی قولو کاریگەر هەست پێ دەکەین، کە سەلیقەو توانای بیری و خەیالی فراوان و بەتوانایی خاوەنەکەی نیشان دەدات لەمامەلە کردنی لەگەڵ منداڵان و داخوازیەکانیاندا، بەهەمان شیوە لایەنی هونەری چیرۆکەکانیش زۆر بەرزن، تەکنیکی تازەو وردەکاری زۆری بەکارهیناوە لەگەڵ ئەو بیرەمەزن و بنچینەیی و پرسیارە هەستیارو گرنگانەی کە لەلای منداڵانی ولاتەکەی دروستی کردووە.

لە کورتە چیرۆکی (ناچار)دا، چەند وینەیەکی راستەقینەی ژیانی کولەمەرگی خەلکی تورکیا بەتایبەتی و جیهانی سەرمایەداری بەگشتی نیشان دەدات «باوک فەراشی نووسینگەیەک بوو، رۆژانەیەکی کەمی وەردەگرت و ناچار بوو، بەو رۆژانە کەمەی (5) سەر خیزان بەخیو بکات، قسەی هەوەڵ و ئاخری ئەمەبوو (بیگاری دەکەم)»[91]......

کاتیک کوری فەراش دەچیت بۆ دیدەنی بابی، دەبینێ کوری کابرای نووسینگەکە، کەئەویش هاوتەمەنی خۆیەتی، بەلام وەکو پیاویکی گەورە هەلس و کەوت لەگەڵ بابی دەکات، بەردەوام سووکایەتی و فەرمان بەسەریدا دەکات و پێی دەلیت: (تۆ مەجبووریت دەبیت هەمووشتیک قبووڵ بکەیت)[92].

لەکاتیکا کوری فەراشەکە، زۆر نیگەرانە لە کیشەیەکی سایکۆلۆژی قولدا دەتلیتەوە، بەبینی ئەم جیاوازیە گەورانە، پرسیاریکی لەلا دروست دەبێ: (باوکە بۆ مەجبووریت بەقسەی ئەم منداله بکەیت؟!)[93]

(بابە)، بەچەند وشەیەک، گریی چیرۆکەکەو گریی دەروونی منداڵانی ولاتەکەی دەکاتەوە، هەورەها دەیەویت راستی سیستەمی سەرمایەداری و یاساجیگیرو نەگۆرەکانیان و ناوەرۆکە دژی مرۆییەکانیان بخاتە پیش چاوی نەوەی تازە.

باوکە دەلێ: (بۆ ئەوەی بەبیکاری نەمینمەوە، چونکە بچمە لای هەرکەسیکی دیکەش، هەر لیرە خراپترە، واتە (چ عەلی خواجەو چ خواجە عەلی) ئەمانە تەنیا هەر ناوەکانیان جیاوازە، ئەگینا رەوشت و رەفتاریان هەموو هەریەکە)[94].

لەکورتە چیرۆکی (دووهیلکە مریشک)دا،



بەشیوازیکی زانستی و هونەری مامەلەی لەگەڵ (کەس و رووداوو کات و شوین)ی چیرۆکەکەدا کردووەو هەر بەهەمان شیوازی پیشوو لەدوو تووێی مەسەلە چینایەتیەکاندا، بەلام لەمەیاندا، دەیەویت ئەوە نیشانی منداڵانی کریکاران بدات، کە ئەوان هەمیشە هاوپشت و هاو چارەنووسی یەکدین، هەر ئەوان دەتوانن لەگەڵ یەکتریش بژین و لەئیش و ئازارەکانی یەکتریش بگەن.

فیری ئەوەیان دەکات کە یەکتریان خۆش بویت و چارەنووسی ئەوان هەتا دوایی هەر بەیەکەوە گریدراوە.

کاتیک «حەیدەری کورە تاقانەی (برایم)ی کریکاری چنین کاری، لەگەڵ (عەلی رەزای) کوری (سمایل)دا، کە ئەویش کریکارە، لەهەمان کارگە، شەر دەکەن و (عەلی رەزا)، بەرچاوی (حەیدەر) شین دەکاتەوە، کاتیک کە (حەیدەر) دەگەریتەوە بۆ ماڵەوە...)

لیرەدا یەلماز شارەزایانە هاتووە، بیرە ئەساسییەکانی خۆی داریژاوە لەمامەلە کردنی لەگەڵ هەردوو کورە کریکاری ولاتەکەیداو ئامۆژگاریان دەکات کە ئەوانە برای یەکترین و ئەگەر گۆشتی یەکتری ئازار بدەن، ئیسقانی یەکتری ناشکینن، چونکە هەر دووکیان هاوچین و هاوچارەنووسن.

پاشان چارەسەر بۆ گرفتی چیرۆکەکە دەدۆزیتەوەو (برایم)، ئامۆژگاری (حەیدەر)ی کورە تاقانەی دەکا: کورم، (عەلی رەزا) برادەری تۆیە، ئەویش وەکو تۆ منداڵی کریکارە 000000 دواییش بە ئایشێی ژنی دەلێ، کوانووەکە ئاگردەو (دووهیلکە) ئامادە بکە لەسەریەک سینی بۆ حەیدەرو عەلی رەزا دوواتریش چارەنووسی ولاتەکەیی و گیروگرفت و ژیانی پر مەینەتی میللەتەکەی فەرامۆش نەکردووە، لە کورتە چیرۆکی (فاشیزم چییە؟)دا، کۆمەلیک پرسیاری جۆراو جۆری لەلای منداڵانی ولاتەکەی دروست کردووە (منداڵەکە لە دایکی پرسی: دایکە، فاشیست چییە!؟ هیلانەی فاشیستەکان چۆنە؟!، دایکە کە بێ دەنگ بوو، ئەویش وەکو منداڵەکەی بەبەردەوامی ئەم وشەیەی لەرادیۆو تەلەفزیۆن و باس و خواسەکاندا بیستبوو، بەلام ماناکەی نازانێ و نەی دەزانی چ وەلامیکی منداڵەکەی بداتەوە، بۆ ئەوەی ماوەیەک بۆ وەلامدانەوەی پەیدابکات، پرسی: ئەم فاشیستەت لەکوێوە بەبیردا هات بۆ دەپرسیت؟

منداڵەکە گوتی: دوینێ کەلەگەڵ هاوریکەمدا لەقوتابخانە دەگەراینەوە، خەلکانی زۆر لە کورو کیژ کۆبوونەوەو پیکەوە هاواریان دەکرد((مردن بۆ فاشیستان)) دەبێ لانەی فاشیستەکان ویران بکەین...

دایکە، فاشیست بالندەیە؟ هیلانەکەی چۆنە؟!..[97].

بەو شیوەیە یەلماز لە نووسینی ئەم چیرۆکانەدا، شیوازی (ساناى چیژ وەرگر- سهل الممتنع)ی گرتووەتە بەرو زۆر بەسانایی و دەست رەنگینی‌یەوە کۆمەلیك گرفت و کیشەی گرنگی باس کردووەو هەرخۆیشی چارەسەری گونجاوو لۆژیکی بۆ دۆزیونەتەوە.

هەروەها، شیوازی لەنووسیندا، شیوازیکی (پەروەردەیی) سەرکەوتووە چونکە بەشیوەیەکی (ناراستەوخۆ -غیر مباشر) و لەپشتەوەی رووداویکەوە پەیامی خۆی دەگەیەنیتە منالان و هۆشیاریان دەکاتەوە، کە بیگومان ئەم شیوازە کاریگەری زیاتر دروست دەکات لەسەر دەروونی مندالان.

هەروەها ، یەلماز شارەزایەتی لە (سایکۆلۆژیەتی) مندالاندا هەبووەو شارەزایانە دیتە مەیانەوە لەم بوارەدا، کاتیك لەکورتە چیرۆکی (واهیمە)دا، (کاتیك مندالیك، لەگەل باوکیدا بەلای کەلاوەیەکدا تیدەپەرن، مندالەکە دەلی: باوکە ئەوە تارمایی‌یەو ناویرم لیرەوە برۆم)، دیارە پیشتر لەلایەن مجەوەری مزگەوتەکەوە ترسینراوە..)[98].

یەلماز هاتووە، لەچیرۆکەکەدا، وەکو پسپۆریکی زانستی دەروون ناسی، ئەو دیواری ترسەی کە چەندین وەختە، کۆمەل دروستی کردووە لەلای مندالانی ولاتەکەی، دەیروخینی و لەجیگایدا، تواناو ئازایەتی و بەهرە، دروست دەکات، دەیەویت کۆمەلگایەکی خاوەن تواناو بەرهەم هین سەرلەنوی بنیاد بنیتەوە.

**نەخشە سیاسی‌یەکانی (یەلماز)**
**ئاویتە کردنی لەگەل هونەرەکەیدا:**

(یەلمان) سەرەتا ویستی لە ریگای سینەماوە بناسریت و پاشان بتوانی جەماوەریکی تایبەتی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوەو لەم ریگایەوە هەلویستی شۆرگیرانەو پەیامی تایبەتی خۆی بگەیەنیت بەجەماوەر.

لەرووی خەباتی شۆرشگیرانەشەوە، بروای تەواوی بەخەباتی چینی کریکار هەبوو، وەکو خۆی پیمان دەلیت: سەرەتاو دوا قسەی من، خەباتی چینایەتی‌یە، خەباتی چینی کریکارە بۆ گرتنە دەستی دەسەلاتی سیاسی هەروەها ئەم خەباتەش شیوازی جۆر بەجۆری هەیە، ئیمە خەباتی سیاسیمان هەیە، خەباتی ئابووریمان هەیە، هەروەها خەباتی (رۆشنبیری و ئایدۆلۆژی)شمان هەیە، جا کاری هونەری بەتایبەتی (هونەری سینەما) جۆریکە لە خەباتی سی‌یەم، کە دەچیتە چوارچیوەی خەباتی (رۆشنبیری و ئایدۆلۆژی)یەوە، لەهەمان کاتدا خەباتی (سیاسیشە)، چونکە لەریگای سینەماوە دەتوانریت جەماوەری خەلك جۆش و خرۆش بدری و کار لەهەست و سۆزیان بکری و ئەم هەستانە بەلای شۆرشدا وەربچەرخینریت[99].

هەتا کۆتایی ژیانی، پشتیوان و هاوخەباتی خەلکی چەوساوەو ستەمدیدە بوو، هەتا کۆتاییش دژی رژیمی تورك بوو، وەکو کوردیك بیری دەکردەوە، پاشان چارەنووسی خەلکی کورستانیشی گری دەدایەوە بەخەباتی خەلکی زەحمەتکیش و چینی کریکارەوە.

(یەلمان) دەلی: (ئەو کاتەی رەش بگیری بۆ کۆمۆنیستەکان کرا لە سالی 1952دا لەناو ئەوانەدا چەند شاعیریك بوون، من شیعرەکانی ئەوانم ئەخویندەوە)، لەدریژەی قسەکانیدا ئامارژە بەراستی و ماهی‌یەتی کۆمۆنیستەکانی تورکیا دەکات و دەلی: (ئەوانەی فریان بەسەر (سۆسیالیستی زانستی)یەوە نەبوو، زیاتر ئایدیالیستی و (یۆتۆبیانە) بوون، هیچ کەس لەبارەی (مارکسیزم-لینینیزم)) قسەی نەدەکرد، کەس لەبارەی (ماتریالیزمی دیالیکتیکی)بەوە، قسەی نەدەکرد ئەوەی هەشبوو، لەچوارچیوەی ئەدەبدابوو، روونیان نەدەکردەوە کە ئەبی لەگەل کیدا بجەنگین، یان بە چ شیوەیەك بجەنگین، یاخود پیویستە بە چ ئایدۆلۆژییەتیك بجەنگین، هیچ کام لەمانە نەبوو[100].

ئەوکاتەی کە (یەلمان) شاری (ئەدەنە)شی بەجی هیشت، دەلی کە چوومە ئەستەنبول ویستم (حیزبی کۆمۆنیستی) بناسم، تا ئەوکاتەش خەلك بەکۆمۆنیستیان دەزانیم، بەلام لەوی هەستم کرد (فریودراوم) و بەهەر کۆمۆنیستیك دەگەیشتم زیاتر نائومیدی‌یان دەکردم، ئەوکاتە نەمدەزانی ئەمە چۆن روون بکەمەوەو چ ناویك بۆ ئەم تەفرەدانەی خۆم دابنیم، هەتاکو گرتنەکەی سالی 1972م، کاتیك دەستم بەخویندنەوەی زیاتر کرد هەستم کرد لەلایەن (رویزیونیزم- تحریفی‌یەت)ەوە، فریودراوم، تا ئەوکاتەش من لە (مارکسیزم-لینینیزم) نەگەیشتبووم، مەبەستم ئەوەنی‌یە کە ئیستا بەتەواوی لی‌ی تیگەیشتووم، بەلکو هەر تەنها دەستم بەلیکۆلینەوەو خویندنەوەی کرد[101].

پەیوەندی نەکردنی (یەلمان) بەگروپیکی سیاسی‌یەوە لە تورکیا لەشۆرشگیری ئەوی کەم نەکردۆتەوە، بەلکو گومانەکانی ئەو زۆر لەجی‌ی خۆی‌دا بوون سەبارەت بەو بزووتنەوەو هیزانەی کە لەتورکیاو ناوچەکەو بگرە لەجیهانیشدا هەبوون، لەم بارەیەوە (یەلمان) تیروانینی خۆی دەردەبری و لەوەلامی پرسیاریکدا کە (ئایا ئەو هیزانەی کە بزووتنەوەی کورد لەتورکیا ئەتوانیت هاوکاری‌یان بکات کامانەن؟...

(یەلمان) دەلی: ئەبی ئەوە بزانین ئەو هیزانەی لە تورکیادا هەن، ئامادەی ئەوە نین دان بەسەربەخۆیی کوردستاندا بنین، تەواوی ئەو دەولەتانەی لەرۆژهەلاتی ناوەراستدان، تەنانەت لە ئیشارەت کردنیش بۆ ئەم مەسەلەیە ترسیان لی دەنیشیت[102].

(یەلمان) وەکو مرۆڤیکی چەپ زیاتر رەخنەو گازندەکانی خۆیشی ئاراستەی چەپەکانی ناوچەکەو جیهان دەکات، کەپی دەچی بزووتنەوە چەپەکانی ناوچەکە تووشی جۆریك لە (نەزانی دووسەرە) بووبن سەبارەت بەدۆزی کورد.

یەلماز لەبەرئەوەی لەپشتی کاری هونەری و سیاسی‌دا هوشیاری‌یەکی قولی هەبوو، زانستی یانە دەیروانی‌یە کاری سیاسی. بەدیدیکی فراوان و واقیع بینانەوە دەیروانی‌یە کۆمەلگاو دەیویست بونیادی کۆمەلگای لەبناغەوە بگۆری.

ئەگەر کۆمەلگا (هۆشیارو تەندروست) نەبیت بی گومان ناتوانیت شۆرشی دروست و سیاسەتی دروست پیادە بکات، باشترین ئامیریکیش کە بەدەستیەوەبوو بۆ ئەو مەسەلەیە، بەپلەی یەکەم (سینەما) بوو.

کە لەپشت توانای فیکری و جیهان بینی‌یەوە، لەگەل دەسترەنگینی هونەری و سیحری سیناریۆو دەرهینان و رۆل بینینەکانی، لەهەموو ئەوشتە هەستیارانەشی دەدا کە کاریان لە بونیادی کۆمەلگاکەی کردبووو، ئەو وەکو مەسەلەیەکی ئەخلاقی ئەیروانی‌یە سیاسەت، لەبەرئەوە بەئەمانەت و لیپرسراویتیشەوە دەستی بۆ ئەو کارە برد.

یەلماز سەرەتا دەیویست کودەتایەکی کۆمەلایەتی، رۆشنبیری لە ولاتەکەیدا بکات و زەمینەی لەبار سازو ئامادەبکات،

ئینجا بویرێ باس له شۆرش بكات، ئەم هەلویستەش بەئاشكرا لەفیلمو نوسینەكانیدا دەردەكەویت، چونكە سیاسەت لای ئەو كۆمەلیك چەمكی لەخۆدەگرت، كەبەبی هەر یەكیك لەو لایەنەنانە سیاسەت لایەنی تەواو كاری خۆی ون دەكات، بۆ ئەمەش هەموو جۆرەكانی خەباتی (رۆشنبیریو چینایەتیو سیاسیو ئابوری) سەرەتا لەچوارچیوەی هونەرو ئەدەبەوە خستیە روو، تا ئەو كاتەش كە له توركیادا بوو، سەر بەریكخراویك یان پارتیكی سیاسی نەبوو، بەلام هەمیشە كاریگەری لەسەر بزوتنەوەی شۆرشگیری توركیا بەگشتیو بزاڤی (شۆرشی باكوری كوردستان) هەبووەو كاریگەری لەسەر هونەرو ئەدەبی شۆرگیریو رۆلی بەرچاوی هەبووە لەم بارەیەوە، هەروەها یەكیك بوو لەو هونەرمەندە پیشكەتووخوازانەی كه هەرگیز (سازش)ی لەگەڵ رژیمی توركیا دا نەكردووه[103].

بەلام كاتیك كه لەتوركیا دەرچوو، لەئەوروپا شان بەشانی چالاكی (هونەریو رۆشنبیری) دەستی به چالاكی سیاسی كرد لەشیوەی ریكخراوبووندا. هەرچەندە فیلمەكانی یەلماز هەمیشە دەربارەی نیشاندانی (زەبرو زەند) بوون، بەلام ئەمە لەراستیدا نیشاندانی ئەوزەبرو زەندە بوو كەدژی ئەوگەلانەدەكرا كه لەتوركیا دەژیان، ئەمەش بەتەواوی پیچەوانە بوو لەگەڵ خەباتە سیاسیەكەیدا، ئەو بزوتنەوە سیاسیەی خۆی خەریكی هینانەكایەیبوو، بەبێ ئەوەی ئامانجی سەركردایەتی كردنی بووبیت، ئەو بزووتنەوەیە گەر لە دایك بایەو (مەرگی یەلمان) ریگەی بدایە بەلەدایك بوونی، تەواو ریرەویكی (سیاسی-میان رەوانە) ی دەگرت، چونكە یەلماز بروای وابوو (زەبرو زەند) گەر دەمامكو چارشیوەی پیشكەوتنخوازانەو شۆرگیرانەش بپۆشێ هەر تاوانەو ماڵ ویرانكەریو تیرۆرستییە، تەنها یەك زەبرو زەند رەوایە، ئەویش دژی زەبرو زەندو چەوساندنەوەیە، بەو مەرجەی زۆربەی گەل پیٚی رازی بیت[104].

هونەرو سیاسەت لەلای یەلماز دووشتی جیاوازبوونو لەهەمان كاتیشدا تەواوكەری یەكتربوون، هونەر دەبوو هۆكاری یاریدەدەربیت بۆ شۆرش، هەر ئەو پەیوەندییانەی هونەرمەندیش لەگەڵ جەماوەردا دەكرێ لەدواییدا ببیتە پەیوەندییەكی سیاسیانە، ئەمە بۆ ئەو هونەرمەندەی كه ریبازیكی سیاسی راستو دروستی گرتبێ[105].

لەراستیدا گەوهەری كارەكانی یەلماز بۆخۆی گوتاریك بوو، گوتاری یەلماز لەهونەردا بەتەنها (هونەربۆ هونەر) نەبوو، بەلكو یەلماز لەریگەی هونەرەوە گوتاریكی (فیكری-سیاسی-رۆشنبیری-كۆمەلایەتی) پیشكەش كرد، كه هەر ئەمەش بوو وای كرد (بوونیكی فیعلی) بدات بەهونەرەكەی، بزاوتو ژیانیش بخاتە نیو هونەری ئەو كاتە لە (توركیا)، جیاواز لەو هونەرمەندانەی ئەوسا كەلەوێ ئیشیان ئەكرد.

جدییەتی یەلماز لەئیشەكانیدا لەویوە سەرچاوە دەگرێ كه بەراستی توانیویەتی ئەوەی كه ئەیەویت بیلیت ، بەبێ سڵ كردنەوە بیكاتە پرۆژە، كەهەریەك لەئیشەكانی باس لەو پیناسە ئەكات كه تاكی كوردی هەلیان گرتووە، لەلایەكی ترەوە لەگەڵ ئەو پەیوەندییە بابەتییەی كەلەنیوان ئەو دووشتەدا هەیە، جیاوازییش هەیە، (كاری هونەری) بەتەنها ناتوانێ بەتەواوی ئەركو كارەكانی خەباتی سیاسی هەستیت، بەلكو دەبێ بەچەند كاریكی سیاسی تەواو بكریتو پشتیوانی لیبكریت، تاوەكو كاریگەری خۆی تەواو بكات چالاكی سیاسیش دەبێ لەریگای چەند كردەیەكی وردی وەكو (نووسینو رونكرنەوەو لیكدانەوە)ی باروودۆخەكە ئەنجام بدرێ[106].

دەبێ ئەوەش بلیین كه شان بەشانی ئەو ریچكە شۆرشگیرییە ئاشكرایەی لەئیشەكانیدا، هەرگیز لایەنی (هونەرمەندیتی) فەرامۆش نەكراوە، ئەو سیحرەی كه لەفیلمەكانی یەلماز دا هەیە، وای لیكردووە كه لەهەرشوینیك فیلمیكی ببینرێ بێشك خاوەنەكەی پیدەناسریتەوە، لایەنی سەركەوتووی یەلماز لەهەلبژاردنی بابەتو شوینو ئەكتەردا، لەتەكنیكی وردو سەركەوتوانەدا لەمیتافۆرو لایەنەكانی جوانكاریداو لەدەرهینانندا، جیهانیكی تازەو سیحراوی بەخشیوەتە كارەكانی ، كه بەشیوەیەك هەر فیلمیكی یەلماز ببینریت بەتەواوی لەزاكیرەی بینەردا دەچەسپێو لەبیر ناچیتەوە بگرە ئەم حالەتە لەرۆمانو چیرۆكەكانیشدا هەر دەبینرێ، لایەنی سەركەوتوویی هونەرمەندو ئەدیبیش لەوەدایە كه ئیشەكانی لەبیری بینەردا بەزیندوویی بمینیتەوە .

یەلماز ئەم دروشمەی هەبوو بۆ هونەر (هونەر چەكیكە هونەر تفەنگیكە بەلام هونەر زمانیكی تایبەتی خۆی هەیە، زمانیك كه بەتەنها تایبەتە بەهونەرەوە، هەر كەسیك پیویستە ریزی ئەو زمانە بگریت، ئەگەر تۆ ریزی ئەو زمانە نەگریت، ئەوا بەو چەكە دەكوژرییت!![107].

سەبارەت بەئایندەی سیاسی كوردستان، یەلماز هەلویست و ئامانجیكی روونو ئاشكرای هەبوو، لەم بارەیەوە یەك چارەسەری بەشتیكی راستو دروست دەزانی، ئەویش (یەككگرتن بوو لەشیوەی كۆماری یەككگرتوو)دا، لەچوارچیوەی هەر یەك لەو دەولاتانەی كه كوردیان تیا دەژی.

یەلماز بروای بوو كه داخوازی كوردەكان چ له توركیاو چ له ئیران چ لەعیراقو شوینانی دی تەنها لەیەك ریبازی كاركردنەوە ئەتوانن بەدی بین، پاشان دەلێ: ئیمە چاوەرێی ئەوەین بزانین له (خود موختاری) (عیراقو ئیران) چی بەدەست دیت!.. یان بەجۆریكی تر من لای خۆمەوە پیشنیاری هیچ چاریكی بنەرەتی یان بنەبرناكەم، ئەوە میللەتی كوردە كه له پرۆسەی بزوتنەوەیەكدا، ئەبیت دەستنیشانی ئەوە بكات چی چاكەو چی خراپەو لەویوە ریگای چارەسەركردن لەبەر بگریت[108].

ئەمە وەكو چارەسەریكی سەرەتایی، ئەگینا هەرگیز یەلماز ئەوەی وەلا نەخستووە كه نیشتمانیك هەیەو نەتەوەیەكی لەسەر دەژیو لەئایندەدا (دەولەت) دروست دەكات، جا ئەو دەولەتە چۆن بنیاد دەنرێ، یان كێ بنیادی دەنێ، یەلماز ئەو رۆلە پالەوانیتییە بەبالای خۆی نابریت، بەلام هەتا دواییش هەر بروای بەخەباتو تیكۆشان بوو لەو پیناوەدا.

سەبارەت بە مەسەلەی كورد لەتوركیا (هەمان ریگە چارەی تیكۆشان بوو، لەپیناوی كۆماریكی یەككگرتووی (كوردو توركا) بۆ قۆناغی ئیستا، ئەگینا كەبزوتنەوە هاوبەشییەكە سەركەوت قۆناغیكی نوێ هاتە پیشێ ئەوسا (كوردەكان) مافی هەلبژاردنی (چارەنووسی

خۆیان) هەیەو خۆیان دەستنیشانی ئەوە دەکەن کە ئایا ئەیانەویت لەگەڵ تورکدا هەر وابژین یان (دەولەتیکی سەربەخۆ) بۆ خۆیان دروست بکەن[109].

ئەم ئامانجەش بەشیوەیەکی خەیالیو سۆزدارانە باسی نەدەکرد بەلکو بروای تەواوی بەخەباتیکی توندو تۆلی نیوان (کوردو ئەو میللەتانەی تری کەلەتورکیا دەژین) هەبوو، ئەوراستی‌یەی فەرامۆش نەدەکرد کە (دامەزراوی) بەتەنها لەریگای بەئاشتیو دیموکراتی‌کردنی) نیوان ئەو میللەتانەوە دەتوانریت بەدەست بیت.

چونکە یەلماز بروای وابوو کە ئەو دەولەتەی حوکمرانە لە تورکیادا، بەتەنها (دەولەتی تورکەکانە)[110]، لەکاتیکدا ئەو میللەتانەی تر کەلە تورکیا دەژین زۆرلیکراون، لەوانەش (کوردەکان) کە بەتازەترین چەکی سەردەمو تازەترین شیوازی چەوساندنەوەی سیستەمی بۆرژوایی‌یانە مامەلەی لەگەڵ دەکریٚ.

پاشان یەلماز دەلیٚ: (تەنها کاتیک مەسەلەی سەربەخۆ بوونی کوردستان دەبیتە شتیکی خەیالی کە کوردەکان بەنییەتی پاکی دەولەتەکانی ئەم ناوچەیە (ئومید) یان هەبیت، بۆیە کورد بۆ بەدەست هینانی مافی خۆی ئەبیت پشت بەتواناو هیزی خۆی ببەستیت[111].

یەلماز زۆر جەختی لەسەر ئەوە ئەکرد کەشۆرش بەتەنها ئەرکی لەناوبردنی دەولەت نی‌یە، بەلکو ئەرکی (شۆرشگیراندنی هەموو کۆمەلە)[112].

هەتا دوا ساتەکانی ژیانیشی ئەوە ئامانجی بوو، دوایین جار لەئەوروپا بیری لەوە دەکردەوە کە ریکخراویکی نویٚ دروست بکات، کە سەربەخۆیی خۆی بپاریزیتو بشتوانیت ریگا بۆ یەك گرتنی هیزە رادیکالە ئۆپۆزسیۆنەکان) خۆش بکات دژبەبەرەی فاشیست، دوای ئەوەی کەلەدوای کۆدەتا سەربازی‌یەکەی سالی 1980نەیتوانی ئەو پرۆژەیە جیٚ بەجیٚ بکات وەکو کەسیکی سەربەخۆو بیٚلایەن[113].

بەلاّم مخابن، مەرگ ریگەی نەدا کاروانی ژیانو بەرگری بەردەوام بیت. هەتا داگیرکەر هەبیت قوربانیش بەردەوام دەبیت، هەتاکو ستەمو خیانەت لەئارادا بیت، لاپەرەکانی میژووش سنگ ئاوەلاّ دەکەنەوە بۆ گەورە پیاوانو خەلکی بویر، یەلمازیش دووایین شۆرشگیری نابیٚ کەلاپەرەکانی میژوو لەئامیزی بگرن، ئەو بەکردەوە سەلماندی، کە بەهەلویستی شۆرشگیریو بەهرەی هونەریو ئەدەبیو سازش نەکردنی لەگەڵ بەرەی فاشستدا دوژمنی داخ لەدلی تاساندووە، دوای مەرگی یەلماز جگە لەمیدیای تورکان هیچ راگەیاندنیکی دی ئامادە نەبوو بەچاوی سوکەوە ئەو مەرگە باس بکات

هەموو جیهان بەریزەوە باسی مەرگی نائاسایی یەلماز یان دەکرد، مانشیتی رۆژنامەکانی تورك نەبیت.

بۆ نموونە: لەرۆژنامەی (تەرجمان)ی تورکەکاندا نووسیبویان (پیاوکوژانیش دەمرن، بکوژی عەرەق خۆریش پیش ئەوەی فرسەتی خەرج کردنی ملیۆنەهای لەپارەکانی بۆ برەخسیت، مرد، (یەلماز گیونای) بکوژی (دادوەر)، لەپاریسو بەداماوی مرد. ئەو یەلمازە هەتا دووایی خائینیك بوو...)

بە گەورەییش لەسەرەوە نووسرابوو: دوایین چیرۆکی خیانەتکارانەی ئەو لە گۆرستانی (پیرلاشیز) نیژرا[114].

ئەگەر ئاوەهایان بە (یەلماز گیونای) نەوتایە دەبوایە گومان پەیدا بکەین لە کوردبوونی یەلمازو رەوشتو هەلویستە شۆرگیریەکانی، لە هونەرمەندیتیو کاریگەری هونەرەکەی لەسەر میزاجی میردمندالاّنی تورکەکان.

سلیمانی
ئایاری 1998

**پەراویزەکان:**

*رۆژنامەی ولاّت، ژ(86)، ایلول-1995، وتاریك بەناونیشانی (گونای الذی هزم الفاشیة)، نووسینی (جلال زنگا بادی)، بەزمانی عەرەبی بلاّوکراوەتەوە، لا (6).
گۆڤاری (هیڤی هیوا)، ژ (3)، شوباتی /1985، وتاریك بەناونیشانی (ژینە نیگاریا یەلماس گیونای)، بەزاری کرمانجی ژورو بەپیتی لاتینی نووسراوە، لا(11).

) ئەدەبی فۆلکلۆری کوری، لیکۆلینەوە، نووسینی (دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵ)، بەغدا سالی 1970، لا36.
) گۆڤاری کاروان، ژ(8)، ئایاری /1983، نووسینی (سەلاحەدین صالح مەجید)، لا (75-76) ئەم نووسینە پیشتر لە گۆڤاری (الدستور)دا نووسراوەو برای نوسەریش بەهەندیٚ زیادکردنەوە، جاریکی تر لە عەرەبییەوە وەریگیراوەتە سەر زمانی کوردی.
) کاروان، ژ(8)، هەمان سەرچاوە، لا (75-76).
) گۆڤاری هیڤا-هیوا، ژ (3)، هەمان سەرچاوە، وتاریکی جیا لەوتارەکەی تری بلاّوکراوەتەوە بەناونیشانی (دوا سەفەری ریبواریکی نەسرەوت)، نووسینی (س.ن)، بەزاری کرمانجی ناوەراست، لا (9).
) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، ژ(1) سالی (1363)، چاوپیکەوتنیکە لەگەڵ (یەلماز گیونا)، لا (73) بەزمانی فارسی. پیشتر (حمەکریم عارف) وەریگیراوە بۆ کوردیو منیش سوودم لەبەراورد کردنی هەردوو دەقەکە وەرگرتووە بۆ ئەم باسە.
) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشو، لا(73).
) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژینەنگاریا یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (11).
) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا(73).
) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا(73).
) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، (دوا سەفەری ریبواریکی نەسرەوت)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا(9).
) گۆڤاری (کاروان)، ژ (8)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (75-76).
) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)،هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا(73).
) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژینەنگاریا یەلماز گونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (11).
) رۆژنامەی ولاّت، ژ(92)، 18ی-ئەیلولی-1995، لەیادی (11)یەمین سالرۆژی کۆچی دوایی هونەرمەند ولاّتپاریزی کورد (یەلماز گیونای)، لا(7)، نوسینی (باوکی بەهمەن).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (73).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژینەنگاریا یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (11).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (73).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، دوا سەفەری ریبواریکی نەسرەوت، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (9).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ(92)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (7).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژینەنگاریا یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (12).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، دوا سەفەری ریبواریکی نەسرەوت، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (9).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، ژ (1)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (73).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، ژ (1)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (73).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، (او سمبل شورش بود)، مصاحبه بانوینده- انقلابی ترکیا (نیهات بهرام)، چاوپێکەوتنیك لە گەڵ شۆرشگێری تورکیا(نیهات بهرام)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (79).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (73-74).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، ژ (1)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (79-80).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (80).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (80).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (74).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15) (چاوپێکەوتنیك لەگەڵ خودی (یەلماز گیونایدا) لەلایەن گۆڤاری |دیرشپیگل)ی ئەلمانییەوە بەناونیشانی (یەلماز گیونای پادشایەکی دزیوو یاخی یەکی سەرکەوتوو)، کە لەژمارەی (48)ی سالی (36)هەمی رۆژی (29-نۆڤەمبەری-1982)دا، لەگەڵ هەمان گۆڤاری ناوبراودا (دیرشپیگل) سازدابوو)، کوردۆش لەئەلمانییەوە وەریگیراوە بۆ زمانی کوردیو لە گۆڤاری (کاروانی) ژمارە (15)ی، کانوونی یەکەم-سالی دووەم-1983، لا (120) بلاوکراوەتەوە.

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوەی پیشوو،لا(121).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (74).

) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە(15)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (120).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (74).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژینەنگاریا یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (12).

) گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (15)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (120).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ(92) هەمان سەرچاوە، لا(7).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە، لا (120).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە، لا (120).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە، لا (120).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە، لا (120).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (74).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە، لا (121).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوەی ، لا (120).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژینەنگاریا یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (2).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوەی ، لا (121).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژ(3)، ژینەنگاریا یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (12).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (80).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (80).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122-123).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ (86) 16-ئەیلول-1995، نووسینی بەزمانی عەرەبی (جلال زنگابادی)، لا(6).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ (86)، هەمان سەرچاوە، لا (6).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ (86)، هەمان سەرچاوە، لا (6).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ (92)، هەمان سەرچاوە، لا (7).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژ (3)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (12).

) رۆژنامەی (ولات)، ژ(92)، هەمان سەرچاوە،لا (7).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژ(3)، هەمان سەرچاوە، گوتاری یەلماز گیونای بەزمانی کرمانجی ژوورو، لا (9).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوە، (مایلماز گونەی از دست دادیمە)، بەپێنووسی(ا،د)، لا (77).

) گۆڤاری (هیڤی-هیوا)، ژ(3)، هەمان سەرچاوە، (شینا یەلماز گیونای)، لا (13).

) گۆڤاری (خاك)، ژمارە(3)ی سالی یەکەم، 10ی-ئەیلولی-1977، نوسینی باسط، لا (47).

) سیناریۆی فیلمی (میگەل)، یەلماز گیوانی، سالز بورگ-1989، (کوردۆ) لەئەلمانییەوە کردوویەتی بەکوردی، لا(2).

) سیناریۆی فیلمی (میگەل)، یەلماز گیونای، هەمان سەرچاوە، لا(2-5).

) (میگەل)، یەلماز گیوانی، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا(41).

) (میگەل)، یەلماز گیوانی، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا(41).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوە، لا (75).

) ئەم بابەتەم بەوەرگیردراوی لە : (گۆڤاری وەرگێران)، وتاری (هونەری حوکمرانیکردن)، (میشیل فۆکۆ)، ژمارە/1، هاوینی -1997، لا (5)، وەرگێرانی لەفەرەنسیەوە (نەجات حمید ئەحمەد)، وەرم گرتووە.

) گۆڤاری (الثقافة الجدیدة)، ژ (244)، نیسانی-1992، نووسینی (شیارسلیمان)، لا (139).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (122).

) گۆڤاری (الثقافة الجدیدة)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (138). ئەم چاوپێکەوتنە پیشتر لە گۆڤاری (ایلی راما)ی فەرەنسی، ژ(1703) لە (1-ئەیلولی-1982)دا سازدراوە.

*زیندانی نیوە کراوە: ئەو زیندانەیە لە تورکیا بۆ ئەو کەسانەی کەسێ بەشی ماوەی زیندانییەکەیان تەواو دەکەن و بۆیان هەیە ماوەیەکی کورت مۆلەت وەربگرن و لەکاتی تەواو بوونی مۆلەتەکەدا بگەرێنەوە، بەلام ئەگەر

نەگەرانەوە، ئەوا جاریکی تر کە گیران دەکرینە زیندانی داخراوەوە.

) رۆژنامــەی ئاســۆ، ژ(29)، 10-2-1990، نووسینی (خـالید زەنگەنـە)، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) رۆژنامەی ئاسۆ، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (10).

) گۆڤاری (الثقافة الجديدة)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (139).

) گۆڤاری (الثقافة الجديدة)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (139).

) گۆڤاری (الثقافة الجديدة)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (139-140).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوە، لا (80).

*رۆژنامــەی (وڵات)، ژ(86)، هــەمان سەرچاوە، لا(6)

*(ســەلیمیيە) نــاوی زیندانیکــە لــە تورکیا.

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوە، لا (80).

) گۆڤاری (الثقافة الجديدة)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (137).

) فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە کورتە چیرۆك، یەلماز گیونای، چاپی دووەم-1991، لەبڵاوکراوەکانی (نووسەرانی کوردستان-لقی کەرکوك)، مامۆستا (حەمەکریم عارف) لە فارسییەوە وەرگیراوە بۆ کوردی.

) فاشیزم چییە؟ ، کورتە چیرۆکی (ناچار)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (5).

) فاشیزم چییە؟ ناچار، هەمان سەرچاوە، لا(15).

) فاشیزم چییە؟ ناچار، هەمان سەرچاوە، لا(7).

) فاشیزم چییە؟ ناچار، هەمان سەرچاوە، لا(7).

) فاشیزم چییە؟ کورتە چیرۆکی (دووهیلکە مریشك)، هەمان سەرچاوە، لا(11).

) فاشیزم چییە؟ کورتە چیرۆکی (دووهیلکە مریشك)، هەمان سەرچاوە، لا(15).

) فاشیزم چییە؟ کورتە چیرۆکی (فاشیزم چییە؟)، هەمان سەرچاوە، لا(3).

) فاشیزم چییە؟ کورتە چیرۆکی (واهیمە)، هەمان سەرچاوە، لا(15).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، زبان هنر، از زبان گونەی، هەمان سەرچاوە، لا (75).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، یك اتوبیو گرافی مختصر، ، هەمان سەرچاوە، لا (73).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، هەمان سەرچاوە، لا (73).

) یەلماز گیونای، نامیلکە، چاوپیکەوتنیك لەگەڵ (یەلماز گۆنەی)، ئەم چاوپیکەوتنە پیشتر لە ژ(2)ی گۆڤاری (جیهانی برای فتح) سالی 1364، بڵاوکراوەتەوە گۆرینی لە فارسیەوە (جوانرۆ سیوەیلی)، لا (23-24).

) (ملحمة الانبعاث، چاوپیکەوتنیکی (یالچین کوچەك))) لەگەڵ (عبدالله ئوچ ئالان).

) گۆڤاری (کاروان)، ژ(15)، هەمان سەرچاوە ، لا (123).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، زبان هنر، از زبان گونەی، هەمان سەرچاوە، لا (76).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، زبان هنر، از زبان گونەی، هەمان سەرچاوە، لا (75).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، زبان هنر، از زبان گونەی، هەمان سەرچاوە، لا (76).

) یەلماز گیونای، نامیلکە، هەمان سەرچاوە، لا (25).

) یەلماز گیونای، نامیلکە، هەمان سەرچاوە، لا (25).

) یەلماز گیونای، نامیلکە، هەمان سەرچاوە، لا (22).

) یەلماز گیونای، نامیلکە، هەمان سەرچاوە، لا (24).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، (او سمبل شورش بود)، مصاحبه بانوینده-انقلابی ترکیا (نیهات بهرام)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (81).

) یەلماز گیونای، نامیلکە، هەمان سەرچاوە، لا (26).

) گۆڤاری (جیهانی برای فتح)، (او سمبل شورش بود)، مصاحبه بانوینده-انقلابی ترکیا (نیهات بهرام)، هەمان سەرچاوەی پیشوو، لا (81).

**سەرچاوەکانی باسەکە:**


1-فاشیزم چییە؟ کۆمەڵیك کورتە چیرۆکی یەلماز گیونایە، بۆ منداڵان (چاپی دووەم-1991)-(حەمە کەریم عارف) لە فارسیەوە وەریگیراوە بۆ کوردی.

2-المنطق- جزء الاول-سنة 1947-(محمد رظا مظفر).

3-یەلماز گیونای -نامیلکە-چاوپیکەوتنیك لەگەڵ یەلماز گیونای- پیشتر لە گۆڤاری (جیهانی برای فتح)ی ژ(2)ی سالی 1364، وەرگیراوە-گۆرینی لەفارسییەوە (جوانرۆ سیوەیلی).

4-سیناریۆی فیلمی میگەل-1989(کوردۆ) لەئەلمانییەوە وەریگیراوە بۆ کوردی.

5-ملحمة الانبعاث- چاوپیکەوتنیکی (یالچین کوچەك) لەگەڵ (عبدالله ئوج ئالان)دا.

6-وانەی (فەلسەفەی) بەریز (دکتۆر فواد معصوم) لەزانکۆی سلیمانی-18-12-1997.

7-گۆڤاری (جیهانی برای فتح)-11ی سالی 1363(چاوپیکەوتن لەگەڵ یەلماز گیونای. لەگەڵ دەقی وەرگیردراوی ئەو چاوپیکەوتنە لەلایەن (حەمەکریم عارف)ەوە.

8-گۆڤاری (هیڤی-هیوا) -ژ3ی سالی 1985.

9-گۆڤاری کاروان-هەردووژمارەی (8-15).

10-گۆڤاری (وەگیران)-ژ 11ی هاوینی 1997.

11-گۆڤاری (الثقافة الجديدة) -ژ 244 نیسانی 1992.

12-گۆڤاری (خاك) ژ3ی سالی یەکەم (10-ئەیلولی-1997).

13-ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی-لیکۆلینەوە-د.عزالدین مستەفا رەسوڵ-سالی 1970.

14-رۆژنامەی (وڵات)-هەردوو ژمارەی (86-92).

15-رۆژنامەی (ئاسۆ)- ژ (29) ی - 10-2-1990 .

16-لەگەڵ کۆمەڵیك بەدوا گەرانی مەیدانی خۆمو بینینی هەندیك لە فیلمەکانی.

# یەڵماز گۆنای پاشای دزێو یاخییەکی سەرکەوتوو




**کوردۆ**

**لەئاڵەمانیەوە کردوویەتی بەکوردی**

پێم وایە ساڵێك لەمەو بەر بوو لەیەکێ لەژمارەکانی ڕۆژنامەی هاوکاریدا گوتارێکی تەرجەمەکراوی کاك (ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی)م بەرچاوکەوت کە لەسەر فیلمی (مێگەل)ی ڕێژسێۆری کورد (یەڵماز گۆنای) نووسرابوو. بەداخەوە ڕۆژنامەکەم لا نەماوە تا بگەڕێمەوە سەری و ژمارەو ڕۆژەکەی دیاری بکەم.

لە ژمارە هەشتی (گۆڤاری _کاروان)یش دا گوتارێکی کاك (صەلاحەدین ساڵح مجید) لەسەر فیلمی (یۆڵ)ی هەمان ڕێژیسێۆر بلاوکرابووەوە.

لەگەڵ ڕێزی زۆرم دا بۆ کۆششی ئەو دووبرایە، بەلام ئەگەر بلێم گوتارەکە تێرو تەسەل و بی هەڵە نەبوون ئەوا ڕووی ئەو برایانە ناگرێتەوە دڵیان گەرد ناگرێ.

لەم پێودانگەوە بەپێویستم زانی وەکو بینەرێك کەزیاد لە چەند جارێك هەردوو فیلمی (مێگەل) و (ڕێگە)م دیتووەو، وەکو خوێندەوارێکیش کە هەندێ سەرچاوەم دەربارەیان کۆکردۆتەوە مشت و ماڵێك بکەمو چەپکێك زانیاری دیکە بخەمە سەر کاری ئەو برایانەو پێشکەشی خوێنەرە ئازیزەکانی بکەم، بەو هیوایەی کەمێ تامەزرۆییان لەم ڕێژسێۆرە تاقانەیەی نەتەوەکەمان بشکێنم.

بڕوا مەکەن تا ئێستا هیچ فیلمێکی بەرهەم هێنراوی بێگانە هێندەی ئەو دوو فیلمەی (یەڵمان) لەئەوروپا ڕەواجیان بووبێت. شار نەماوە سەریان پێدا نەکردبێت و لەماوەی چەند هەفتەی پیشان دانیان دا هۆڵەکان هەمیشە جمەیان هاتووە.

هەر بەو بۆنەیەوە گەلێ لە ڕۆژنامەکانی ئەوروپا دەربارەیان نووسی، بەلام زۆربەیان تەقریری و کورت و سەرپێی و شێواو. چێترین سەرچاوە ئەو چاوپێکەوتنە بوو کە پەیامنێری گۆڤاری (دێر شپیگل)ی ئەڵمانی لە ژمارە (84)ی ساڵی (36)هەمی ڕۆژی (29)ی نۆڤەمبەری (1982)دا لەگەڵ خودی (یەڵمان) کردبووی، کە پاشان دەقەکەی بەتەرجەمەکراوی پێش چاو دەخەم.

ئەوەی لێرەدا پێویست بەگوتن دەکات ئەوەیە کە ئەم فیلمانەی (یەڵمان) هێندە فریان بەسەر تورکییەوە هەیە کە ڕێگەی بە کوردی دەرهێنان پێ نەدراوە. بەهرەی (یەڵمان) نموونەی هەزاران بەهرەی خنکێنراوی لانەوازی جوامێرانی نەتەوەکەمانە، فیلمەکانی (یەڵمان) هەموو بۆن و تام و چێژێکیان کوردییە، جل و بەرگ و کەل وپەلەکان، دیمەنەکان، سەرپاکی گۆرانی یەکانیان، هەتا گەلێ جار مۆسیقای تەصوریش ئاوازی خۆماڵی کوردیین، سازو ئاوازی شمشاڵی هەست هەژێنی کوردین، لە فیلمی (مێگەل) دا لەکاتی گەیشتنە (ئەنقەرە)و نیشان دانی پەیکەری (ئەتاتورك) مۆسیقای (ئەی کوردینە ئەی مەردینە) پەلکێشی دەریای هەزاران خەیالات دەکات. لە (مێگەل)دا تەنها تاقە گۆرانییەکی تورکی تێدایە کە گۆرانی یەکی (زیولفیو ئیڤانەلی)یەو بەند کراوێك بەکەلەپچەی دەستییەوە لەنێوان دوو جەندرمەدا لەشەمەندەفەردا تێدەچرێنێ : (جەردەکان ناتوانن دونیا داگیر کەن). سەرەتای (مێگەل) شێخێکی نوشتە نوسی کورد پیشان دەدرێ کە چارەی نەخۆش دەکات و بەنزای کوردانەو بەکوردییەکی ڕەوانی دۆبلاژ نەکراو دەکرۆزێتەوەو نزا دەکات. لەفیلمی (ڕێگە)دا کاتێك بەندە پشوو پێدراوەکان بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوەو نزیکی هەوارو مەنزڵ دەبنەوە پڕ بەپڕی پەردەکە دەنووسرێ کوردستان.

وا دەقاو دەقی چاوپێکەوتنەکەی گۆڤاری (دێر شپیگل)ی ئاڵەمانی و ئەو پێشەکییەی بۆیان نووسیوە دەکەمە کوردی، هەرچەندە گەر بەدەست خۆم بایە ڕەنگە هەندێ پرسیارو وەرامم لەبەر زۆر هۆ پشت گوێ خستبا، بەلام وەکی ئەمانەتێکی ئەدەبی و تا خوێنەرانی ئازیز لەنزیکترەوە ئەم ڕێژێسێۆرە بناسن و شارەزای بۆچوونە فیکرییەکانیش بن ئەوا ناچارم سەرپاکی نووسینەکە بەئامانەتەوە پێش چاو بخەم.

(پاشای دزێو، یاخییەکی سەرکەوتوو)

(یەڵماز گۆنای) ئێستا تەمەنی (45) ساڵە، بەنێو بانگترین ئەکتەرو ڕێژێسێۆری تورکیایە، زیاد لە یازدە ساڵی تەمەنی لە گرتووخانەدا بەسەر بردووە، ساڵێك زێدەترە ئاوارەی ئەوروپای ڕۆژئاوا بووە نوێترین فیلمی کە (یۆڵ)ە لەم هەفتەیەدا

لەسینەماكانی ئەڵمانیادا پیشان دەدرێ. مانگی مایسی ئەمساڵ لە ڤیستڤاڵی (كان)دا خەلاتی (چڵە خورمای زێرینی) پێدرا.

لەنێوە ڕاستی ئۆكتۆبەرەوە زیاد لە شەست توركی دانیشتووی ئەڵمانیا، لەنێویاندا هەندێ ساواو مێرمنداڵیش دەدیترێن. سەرگەرمی كارێكی ئاناساییێن، لەگەڵ دووسەد توركی دووره ولات دا فیلمێكی (یەڵماز گۆنای) دەربارەی گیراوەكانی گرتووخانەی یەكێ لە پارێزگاكانی توركیا دەردەهێنن، ژێر تاقی كۆنە دێرێكیان دەست پێدا هێناوەو كردوویانەتە مەنزڵگاو شوێنی خۆیان .

(یەڵمان) لە(1972)ەوە ماوەیەكی كورت نەبێ ئیدی سەرپاكی ئەو ساڵانەی ژیانی لەبەندیخانەدا بەسەر بردووە. لەئۆكتۆبەری (1981)ەوە هەڵهاتووەو لە ئەورووپای رۆژئاوا دەژی. لەو كاتەوەرژێمی توركیا داوای تەسلیم كردنەوەی دەكات، (گورگە بۆرەكان)یش بەخوێنی سەری تینوون و وەك سێبەر وەدووی كەوتوون.

ئەم فیلمە لەبارو دۆخێكی دژوار، بێ رێگە پێدان بەرهەم دەهێنن، بودجەكەی نزیكەی (4ملیۆن مارك)ە، نیوی فیلمەكە لەدێرە شیعرێكەوە وەرگیراوەو لەبەندیخانەدا نووسیویەتی : (شووشەی پەنجەرەكان بشكێنن تا مەلەكان ئازاد بن).

لەتوركیادا (یەڵمان) لای زۆربەی خەڵكی نموونەی هونەرمەندێكی مولتەزیمە كە لە پەردەی سینەماوە هاتۆتە دەر. تەنها فیلمەكانی قەدەغەنەكراون بەڵكە وێنەكانی، پۆستەری فیلمەكانی، ئەو ساڵنامانەی وێنەی ئەمیان لەسەر بووە هەمووی شاردراونەتەوە، پێشان دیواری هەزاران چایخانە، سەرتاشخانە، چێشتخانە، دوكانی بۆیاخچییەكانیان رازاندبۆوە. لە ئۆكتۆبەردا دەسەڵاتدارانی توركیا جنسیەی توركیان لە (یەڵمان)ی هەڵاتوو سەندەوە، ئەم فیلمەی دوایی پاش كودەتا عەسكەریەكەی (12)ی سێبتەمبەری (1980) لە توركیا بەرهەم هێنراوە. (یۆڵ) بەسەرهاتی پێنج بەندی گرتووخانەی دورگەی (ئیمرالی)یە كەیەكی هەفتەیەك پشوویان پێدەدرێ بۆ گەرانەوە بۆ نێو خانەوادەكانیان، هەریەكە دەگەرێتەوە بۆ شارو گوندی خۆی، پێنج چیرۆكی پرلەناسۆر، پر لە بێ ئارامی، نەفامی، خوێن رشتن.

(یۆڵ) بەو هەڵچوون و هونەرە بەرزەوە شەخسیەتێكی بێ وێنەی بۆ سینەمای درامی وولاتی توركیا خوڵقاند، كە پاشان كە سایەتی رێژیسیۆرێكی پیشان دا كە ئازایانە لەگەڵ هەموو دژواریەكدا خۆی ناساندووە.

لە شەستەكاند لەرێگای كۆمپانیایەكی سینەمای توركییەوە كە ساڵانە نزیكەی (250) فیلمیان دەخستە بازارەوە (یەڵماز گۆنای) كورد كە كوری فەرمانبەرێكی دەست رۆیشتووەو لە 1937 دا لەخواروی ئەنادۆڵ لەدایك بووە، لەماوەیەكی كورت دا بووە یەكە هونەرمەندی بەنێوبانگ، ئەو كاتە زانستەكانی ئابووری دەخوێندو هۆنراوەو پەخشانی دەنووسی، تەجرەبەی تاڵی لەگەڵ پۆلیس دا هەبوو چونگە گەلێ جار شاڵاویان بۆ دەهێنا . لەسەر هۆنراوەیەك بەتاوانی چەپ رەوی دووساڵ بەندیی كێشا.

سەرەتا وەكی سیناریۆ نوسێك و پاشان وەك ئەكتەرێك لە جیهانی سینەمادا ناسرا. لەسەردەمی خوێندنی دا ئاشنایی ئەو جیهانە پان و بەرینەی سینەما بوو.

پێشان هونەرمەندانی وەك (بۆرت لانگستەر) و(جاك بلانس) و (مارلن براندۆ)و هەندێ هونەرمەندی دیكەی سەرپەردە كاریان تێكردووەو لاسایی ئەوانی كردۆتەوە، پاشان رێچكەیەكی تایبەتی خۆی گرت كەلەهونەرمەندە توركەكانی پێش خۆی جودایان دەكردەوەو تۆوی نوێ خوازی لەم هونەرەدا چاند.

دەورەكانی هەندێ جار وەكو كەسێكی تەرپۆش و ناسك لە میلیۆدرامادا، گەلێ جاریش وەكو سمێڵ بابرێكی سەرسەختی دەمانچە بەقەد هەمیشە چوون یەك بوون. نەترس، یاخیەكی سەركەوتوو،تۆڵەسێن، جەردەو سالوكێك كە هەمیشە پشتی هەژارانی دەگرت دژی گەورەو دەست رۆیشتووەكان. ئەم (بیلمۆندۆ) یا (جێمس دیان) یا(بروس لی) یا(رۆبن هود) یان(زۆرۆ) و(زاپاتا)ی توركیا بوو. دەمووچاوێكی رۆمانتیكی عەنتیكەی بۆ ئەم دەورانە هەبوو كە تازە لە سینەمای توركیدا چەكەرەی كردبوو وەجێی خۆی لەدڵی لاوان دا كردبووە.

لە (1965)دا لەترۆپكی بەنێوبانگیدا كاتێك موعجیبەكانی نێوی (پاشای دزێو) یان لێ نابوو لەبیست و حەوت فیلمدا دەوری بینی، بێ گومان هەمیشە دەوری پاڵەوان، بەلای كەمیشەوە خۆی سیناریۆی چوار فیلمیانی نووسیبوو.

ئێستاكە دەڵێ: ( ئەوكاتە خەڵكێكی زۆر لەسەر حسابی من دەوڵەمەند بوون، هەر ناسیاوێك بەپارە بۆ دەرهێنانی فیلمێك بەشداری بكردایە پەڵپی دەور بینینی پاڵەوانی دەكرت))

ڕۆژ بووە بەئۆتۆمبیل لەم شوێنەوە بۆ ئەو شوێن سێ جار ماكیاجی گۆریوە، چونكە دەوری پاڵەوانێتی لە سێ فیلمی جیاوازدا دیتووە، (هەر فیلمەی نزیكەی (5000) هەزار مارك)ی لێ دەست كەوتوە، سابۆیە خۆی لەم كۆت و پەیوەندانە رزگار دەكات و لەیەك كاتدا وەكو نووسەرو رێژیسیۆرو ئەكتەر دەست پێ دەكات. فیلمەكانی وەكو (پاسكیل دز)ی (دی ساكاو) (ڤیڤا زاپاتا)ی –ئیلیا كازان– سەرمەشقی بوون.

(پاشای دزێو)، یاخی سەركێش بەئاشكرا لەسەر پەردەوە بانگی شۆرشی كۆمەلایەتی هەڵدەدا، هەمیشە مەرگەساتی واقعی تاڵ و تفت و دڵتەزێنی كۆمەڵگاكەی هەڵدەبژارد. لەساڵی 1971دا (یەڵمان) جەماوەرێكی زۆری پەیدا كردبوو، چەپ رەوەكان وەكو هونەرمەندێكی هەوەس و سێكس و رادیكاڵێكی دوودڵ حسێبیان بۆ دەكرد، راست رەوەكان وەكی بەكرێ گیراوێكی مل هوری كۆمۆنیست لەم ساڵەدا هەشت فیلمی خستە بازارەوە، كاربەدەستانی رژێمی ئەوكاتەش (كەوەك ئێستا عەسكەری بوو)، كەوتنە دڵە راوكە، چونكە فیلمە (گێرە شێوێنەكانی) چ لەوولات و چ لە ڤیستڤاڵەكانی دەرەوەدا سەرنجی خەڵكیان رادەكێشا.

1971 لە ڤیستڤاڵی فیلمە توركییەكاندا لیژنەكە بەتێكرای دەنگ (یەڵمان)یان بە چاكترین رێژیسیۆرو ئەكتەری سینەمای توركی هەڵبژارد، ((ئەم هەواڵە گۆڤاری (ڤاریاتی) ئەمەریكی رایگەیاند)). بەلام بەفەرمانێكی لەدەسەلاتی ئەو لیژنە دادوەرە بالاتر ئەو بریارە هەڵوەشێنرایەوەو جارێكی

دیکە خرایەوە دەنگ دانو یەکێکی دی هەڵبژێردرا .

1972 (یەڵمان) بەحەوتساڵو نیو بەندی حوکم درا، بە تۆمەتی وەی گوایە پشت گیری یاخی بوونی قوتابیانی کردووە. تا لەمانگی مایسی 1974دا باری تورکیا کەمێك هێور بۆوەو کۆمەكو پڕۆتیستی بێگانەکانو ڕێکخراوە خێر خوازەکانی وەکی (ئەمنستی) کاریان کردوو بەهۆی لێ خۆش بوونێکەوە ئازاد کرا.

ئەوجا فیلمی (هەڤاڵ)ی دەرهێنا، ئەم فیلمە درامای پێك گەیشتنەوەی دوو هاوڕێی سەردەمی قوتابخانەیە، یەکێکیان لەرێگەی قۆنتەراتەوە دەوڵەمەند بووەو ئەوی دیکەیان (کە یەڵماز خۆی دەورەکە دەبینێ) بێ سەرەنجامو دڵ پڕ لەهیوا لەزۆرانبازی ژیاندایە بڕوای تەواوی بەهاتنە کایەی ڕژێمێکی سۆسیالیستییە.

لە سێبتەمبەری 1974دا لە شارۆچکەی (یۆرمۆتالیك) لە خواروی ئەنادۆڵ فیلمی (بێ ئارامی) دەرهێنا، بەسەر هاتی جوتیارێکی لۆکە نیشان دەدات کە دووچاری دوژمنایەتی بووەو هەمان کات بۆ بەربەرەکانی چەوساندنەوەی چینایەتی بانگی مان گرتن هەڵدەدات، بەو جۆرە لەنێوان دووبەرداشی کۆنەپەرستیو پێشکەوتن خوازیدا گێژ دەخوات.

(یەڵمان) ئێواران پاش کارکردن لەیەکێ لەلۆقەنتەکانی ئەو شارەدا لەگەڵ دۆستو خوێشانیدا پێکەوە دادەنیشتن، ئێوارەیەك پارێزەرێکی ڕاست ڕەوی ڕادیکاڵی سەرخۆش شالاوی بۆ دێنێو تانەو تەشەری پێ دەکات، پێکدا هەڵپڕژانێك ڕوودەداوو پاشان دەبێتە شەڕە گوللەو پارێزەر تێیدا دەکوژرێ.

خوشکەزایەکی هەژدە ساڵانی (یەڵمان) کە نێوی (عەبدوڵڵا پیوتیون) دەبێ بەخۆیو دەمانچەیەکەوە خۆی تەسلیم پۆلیس دەکاتو دان بەوەدا دەنێ کە کابرای پارێزەری کوشتووە. (یەڵمان) بەتۆمەتی هاوکاری کوژەر دەگیرێو بە هەژدە ساڵ بەندی حوکم دەدرێ.

خوشکە زاکەی بەتۆمەتی فریودانی یاسا بەسێی مانگ حوکم دەدرێ، بەئاشکرا مەسەلەکە دەکەنە مەسەلەیەکی سیاسیو بەجۆرێك ئاڵۆزی دەکەن کەسەرو بنی ڕاستی تێدا بچێت، مەبەستیش تاوانبار کردنی (یەڵمان)ە.

سەرەتای 1981 چەند مانگێك پاش کودەتا عەسکەریەکە (عەبدوڵڵا) دەمرێ، لەڕاستی دا بەگوللەیەك کوژرابوو، گوایە خۆی خۆی کوشتووە تا کێشەکە وون بکاو دادگا لەخشتە بەرێت، بەڵام (یەڵمان) دڵنیایە لەوەی کە کوشتوویانە بۆ بەئاگا هێنانەوەی ئەمیش بووە.

1975لە ڤیستڤاڵی فیلمە تورکییەکاندا سێ خەڵات بۆ سێ فیلم لە چاکترین فیلمەکانی سینەمای تورکیا تەرخان کرا، هەرسێ خەڵاتەکە بەر سێ فیلمی (یەڵماز گۆنای) کەوت.

لەگرتوو خانەدا چیرۆكو ڕۆمانی زۆری نووسی، لەزیندانەوە فیلمی بەبەرهەم دەهێنا، بێ گومان بەیارمەتیو کۆمەکی ئەکتەرە هونەرمەندەکانی دۆستی کەلە دەرەوەی گرتووخانەوە بوون، ئەمانە سیناریۆکانیان بۆ دەکردە فیلم.

سیان لەدواترین فیلمەکانی کە (یەڵمان) خۆی بەدراما نێویان دەبات، (مێگەل)، (دوژمن) ، (ڕێگە) نێوبانگی (یەڵمان)یان لەسنووری تورکیا بەزاند، ئەمانەن فیلمەکانی (یەڵمان)، هەرچەندە خۆی دەری نەهێناون، ((یەکەمو دووەم (زەکی ئۆیکتان) دەری هێناونو (ڕێگەش) (شەریف گوێرن).)) بەڵام بەتوانای بێپایانی خۆی بەبەرهەم هێنراون.

ئەمانە درامان، هونەرن، هاوارن، ژیانی میللەتێکن کەلە گێژەنی ئەم سەدەیەدا لەگێژاوی فیودالەکانی سەدەی نێوەڕاستو زیادڕەوی لەنوێ خوازیدا دەهاڕدرێن، وێنەی خاکێکن کەترس، کیینە، هێز، تێیدا فەرمانڕەوان.

**((ئازادی دێتو وەکی بوومەلەرزە دەبێت))**

## دەقی چاوپێکەوتنەکە :

*ڕۆژنامە نووس : بەڕێز کاك یەڵماز: کاتێك پیاو دەبیستێت لە ژوری گرتوخانەوە فیلمتان بەرهەم هێناوەو سەرپەرشتیتان کردووە پرسێك خۆی دەسەپێنێ: ئایا لەپشتی شیشەکانەوە هەستان بەوە نەکردووە کە ئەستێرەیەکی درەوشاوەی جیهانی سینەمان؟*

یەڵماز : بەهیچ جۆرێك. من تەنها لە هەموو بارو دۆخێکدا بەو پەڕی تواناوە هەوڵم قۆزتۆتەوە.

*ڕۆژنامەنووس : کەواتە بەنهێنیش ؟*

یەڵماز: بڕوانە، لەهەر گرتوخانەیەك میوان بووبم دوای ماوەیەکی کەم سەدی نەوەدو پێنجی بەندەکانم بەلای خۆم دا ڕاکێشاوە، جار جارەش بەتەنها بەندەکان نا.

*ڕۆژنامە نووس : چۆن ئەم سەرپەرشتیە دوور بەدوورە بۆ بەرهەم هێنان بەئەنجام دەگەیەنرا؟*

یەڵماز : خۆشم دەبوو فێربم، تا ئەوکاتەی خۆم دەوری پاڵەوانم دەدیتو سەرپەرشتی دەرهێنانم دەکرد سیناریۆی زیادم لەبەردەست دا بوون، لەهەموو هەلوبوارێکدا خۆم بڕیاردەرو سەر پەرشتی کەر بووم، ئیدی ئەوە دەستی نەدەدا. دوو فیلمی یەکەم کە لەگرتووخانەوە هاتنە بەرهەم سیناریۆکانیان زۆر ڕێكو پێك نەبوون، زۆر گوێم بەدەرهێنایان نەدا، بڕوایەکی تەواوم بە دەرهێنانی هونەری پێکڕایی نەبوو– ئەمە تێڕوانینێکی لنگەو قوچ بوو.

*ڕۆژنامە نووس : دوایی؟*

یەڵماز : سیناریۆی (مێگەل) (دوژمن)، (ڕێگە) ووردوو ڕێكو پێك بوون، هەنگاو بەهەنگاو هەتا جۆری هەڵسو کەوتو ڕووناکیشم لەکاتی دەوربینیندا دیاری کردبوو، خۆم کەسەکانم هەڵبژاردو مەرجم لەگەڵ بەستن لەڕێ نوێنیم دەرنەچن، هەندێ جار لە گەڵ ئەو ئەکتەرانەی لە گرتووخانە دیدەنیان دەکردم لە ژورەکەمدا پرۆڤەی مەشهەدەکانمان دەکرد، هەموو هەوڵێکم دا تا لەدووریشەوە بێت سەرپەرشتی دەرهێنانیان بکەم–لەو بارەدا پیاو لەوە زێدەتریشی لە دەست نایەت.

*ڕۆژنامە نووس : لە (یۆل)دا دوای دە ڕۆژ کارکردن لە ڕێژێسیۆری یەکەمتان سەندەوە داتانە ڕێژێسیۆرێکی دی، چۆن ئەو بڕیارەتان دا؟*

یەڵماز : بەردەوام هەواڵو وێنەی مەشهەدەکانم پێ دەگەیشت، هێندە قاڵ ببووم بتوانم بڕیارێکی بەو جۆرە بدەم.

ڕاسته بڕیارەکە ئاسان نەبوو، بەڵام پێویست بوو. ڕێژیسێوری یەکەم توانا و لێهاتووییەکی وای نەبوو خواستی من ڕەنگ پێ بداتەوە.

*ڕۆژنامە نووس : چۆن توانرا فیلمێکی وەکی (یۆل) لەبەرچاوی زەقی ڕژێمدا بەرهەم بهێنرێ؟*

یەڵماز : توانرا چونکە ڕێگەم بەنووچدان نەدا، لەبارودۆخێکدا هەتا ڕیژێسێوەرە ئازادەکان کۆڵیان داو لەبەردەم کۆسپ دا بەچۆکدا هاتن، بەلای منەوە مەسەلەی ژیان بوو، پێویستییەکی مانەوەبوو تا بەئیسپاتی بگەیەنم پیاو هەر دەتوانێ کار بکا و سەریش بکەوێ.

*ڕۆژنامە نووس : (یۆل) شتێکی کەم نەبوو، بەرهەمێکی هێژایە ناچێتە عەقڵەوە ڕژێم نەیزانیبێ چ ڕوو دەدات.*

یەڵماز : لەتورکیادا سیناریۆی هەموو فیلمێك پێویستە پیشانی ڕەقابە بدرێ، کە ڕەقابە ڕێی دا ئیدی تەگەرە نامێنێ هەتا فیلمەکە تەواو دەبێ پیشانیان دەدرێتەوە. تێپەڕینی سیناریۆی (یۆل) بە ڕەقابەدا شتێکی ئەوتۆ نەبوو. تێپەڕینی فیلمەکەش لای هەموان ئاشکرا بوو. هەوڵ درا کۆسپێ لەڕێیدا قوت کرێتەوە بەڵام سەری نەگرت. بابەتی فیلمەکە بزوتنی زۆری گەرەك بوو، مەشهەدەکان لە شەمەندەفەردا، لەئۆتۆبیس دا، لەم سەر تا ئەو سەری وڵات دەگەڕا. لەڕنووی بەفری چیای (بنگوڵ)ەوە تا دەگاتە سنووری سوریا. چاودێری کردنی جاسوسانە شتێکی ئاسان نەبوو.

مەشهەدی ژەندرمەکان لەو لەقتە خوێناوییەی گوندەکەدا ڕووداوێکی ڕاستییە، فەرماندەکەیان گەڵێ بەخۆ دەنازێ لەو تاوانکارییەیاندا وێنەی خۆی و پیاوەکانی بکرێتە فیلم.

*ڕۆژنامە نووس : ئەو قاوە ڕاستە گوایە بەدزییەوە ڕێگە دراوە ماتریاڵی فیلمەکەت بە قاچاخ بۆ بگەیەننە گرتووخانە؟*

یەڵماز : نەخێر بەڵام بۆ (مێگەل)و (دوژمن) بوارم درا فیلمە نەبڕاوەکە ببینم و تا ڕادەیەك سەرپەرشتی مۆنتاژو شتنەوەو دەنگی بکەم. لەکاتی (یۆل) دا بارودۆخێکی دیکە بوو. کاتێك وێنە گیرانی فیلم تەواو بوو دڵنیا بووم لەوەی گەیشتۆتە دەرەوەی وڵات ئەوجا تورکیام جێ هێشت. ئیدی توانیم خۆم سەرپەرشتی مۆنتاژو شتنەوەی بکەم، بەشێکی لەپاریس بەشێکی لە سویسرا ڕەنجێکی زۆرم لەگەڵ دا. بەڵام پێویستە ئەوە بڵێم کە زۆر هەوڵم داو هەموو ڕێگەیەکم گرتە بەر تا ئەو فیلمە بەبەرهەم بێت، خۆشم ڕێژسیۆری نەبووم. ئاشکرایە گەر وەفاو هیمەتی مەردانەی هەڤاڵانی



گرتووخانەم و بەشدارانی فیلمەکە نەبایە ئەو فیلمە ئەوە نەدەبوو کە ئێستا هەیە.

*ڕۆژنامە نووس : ئەوەی دەربارەی هەڵوێستت لەگرتووخانەدا دەگێڕێتەوە وا پیشان دەدات کە لەوێش هەر (پاشای دزێو) بوویت،*

یەڵماز : بێ گومان هەڤاڵە گیراوەکانم بێ دەسەڵات، چەوساوە، یاخی و سەرکێش نەبوون، منیش لەپێش چاویاندا نیشانەی یاخی گەریبووم. توانیم لەڕێگەی زانیاری سیاسیم و بۆچوونە تایبەتییەکانمەوە تێیان بگەیەنم گەر پیاو سەرکەوتنی بوێت دەبێت بە هاوکاری و یەك دڵ و یەك ڕا ڕەفتار بکات. لێمەوە فێربوون پێکڕا دژی بێ داری، دادۆشین، ڕەفتاری بەد، وەکو شوورە ڕابووەستن–ئەوەکارمان بوو، خەباتمان بوو، ماکی سەرکەوتنمان بوو.

*ڕۆژنامە نووس : کەواتە لەگرتووخانەش دا بەهێز بوویت، وەك ئازیز بوویت ترسناکیش بوویت؟*

یەڵماز : ڕاستە، بەڕێوەبەری گرتووخانەکان لێم دەترسان، چونکە هەمیشە قاوی هەڵهاتن دادەکەوت. بۆیە 1978 بە ئاشکرا گوتم گەربمەوێ هەموو کات بێ دەردی سەری توانای هەڵهاتنم هەیە لەهەر گرتووخانەیەکی تورکیا دابم، بەڵام بیر لەو کارانە ناکەمەوە.

*ڕۆژنامە نووس : ئەمە بلۆف بوو؟*

یەڵماز : بۆچی؟ لە 1979دا وەزارەتی داد بڕیاری گواستنەوەمی لەئەستەمبوڵەوە بۆ یەکێ لە شارە دوورەکان دەرکرد، سەیر ئەوەبوو هیچ گرتووخانەیەك ڕازی نەدەبوو ئەم (یەڵماز گۆنای)یە ترسناکە بگرێتە خۆ. ساڵی پێشوو بەڕاستی زۆر ناساغ بووم، لەترسی هەڵاتن نەیاندەوێرا بمبەنە هیچ نەخۆشخانەیەك، کە بردیشیانم ناچار بوون شەش حەوتووی ڕەبەق بمهێڵنەوە تا گرتووخانەیەك پەیدا بکەن بمگرێتە خۆ. ئەوەبوو لەئەستەمبووڵەوە گوێزرامەوە دورگەی (ئیمرالی).

*ڕۆژنامە نووس : بەخێر گەڕا، ئەوەبوو ڕۆژنامەکان نوسیبویان گوایە گرتووخانەت گۆڕیوەتە (کۆماری گەلی ئیمرالی).*

یەڵماز : بەڵێ. لە (ئیمرالی)دا خۆمان ڕێکخستبوو گەر بمانویستبا حەوت سەد بەند هەموو پێکڕا دەمانتوانی هەڵبێین، کە

هەستیان کرد هێزی‌تایبەتی دەریاییان هێنا، هەشت کەشتی جەنگی و دووهەزار سەرباز ئەڵقاو ئەڵقی دورگەکەیان دا. ئێمە وەزعمان بەد نەبوو، بەهیچ جۆرێکیش بیرمان لەهەڵهاتن نەدەکردەوە. ناچار جارێکی دی منیان گواستەوە.

*ڕۆژنامە نووس : وا پێ دەچێ هەر سەرکردە بوبیت؟*

یەڵماز : من سەرکرایەتی هەڤاڵانی گرتووخانەمم نەکردووە، بەڵکە کۆمەکم پێ کردوون، ڕێکم خستوون، هەوڵم داوە باری ناهەمواری خۆیانیان پێ بناسێنم‌و دژی بوەستنەوە، لەوانیشەوە فێر بووم گەر گەل بەئاگاو هۆشیارانە ڕەفتار بکات هێزێکی هێندە لەبن نەهاتووە کە هەرگیز تێکشکاندنی بۆ نی‌یە.

*ڕۆژنامە نووس : دەتەوێ دەربارەی هەڵهاتنەکەت بدوێی؟*

یەڵماز : ووشەی (هەڵهاتن)م بەدڵ نی‌یە، من وام پێ خۆشە بڵێم بۆ ماوەیەکی کورت‌و تابارو دۆخێکی دیکەزۆر نا بەدڵ لەووڵاتەکەم دوور کەوتوومەتەوە، جگە لەوەی من لەگرتووخانە هەڵنەهاتووم، بەڵکە لەکاتی‌پشوویەکی گرتووخانەدا کە پێم درابوو ئیدی نەگەڕامەوە، چیدی لەژیانی خۆم دڵنیا نەبووم، هەتا لەزیندانەکەمدا. ئیتر بواری ئەوەم نەمابوو لە سەر کارەکەم بەردەوام بم، بۆیە ناچاری ڕۆیشتن بووم. لەگەڵ ژنەکەم‌و دوو منداڵەکەم دا- بۆیەکەم جاری ژیان- تورکیام بەجێ هێشت، بەڕاستی ئازارم چەشت چونکە ولاتەکەم لەهەموو شت خۆشتر دەوێت.

ڕۆژنامە نووس : هەر بەڕاستی هیچ کات لەدەرەوەی وولات نەبووی؟

یەڵماز : لەژیانمدا.

*ڕۆژنامە نووس : ڕاستە بەکەشتیەکی چکۆلە هەڵهاتوون؟*

یەڵماز : ئەو پرسیارە مەکەن بیر لەو هەڤاڵانەم بکەنەوە کە کۆمەکیان پێ کردووم.

ڕۆژنامە نووس : کاتێ سیاسەت دێتە پێش بە ووشەی -ئێمە- دەدوێییت، ئێمە مەبەستت کێ‌یە؟

یەڵماز : خۆم‌و هەڤاڵەکانم.

*ڕۆژنامە نووس : دەتانەوێ لەدەرەوەی ووڵات تەنها خەریکی‌فیلم دەرکردن بن یا ڕۆڵی سیاسیش دەبینن؟*

یەڵماز : ئەو دوانە لەیەکتری هەڵنابوێردرێن. ئامانجم هەموو ژیانم تەنها بۆ هونەر نی‌یە. بەڵکە بۆ ئازادی گەلە. بۆ ئەو ئامانجە بەهەموو جۆرێك کاردەکەم‌و تێدەکۆشم.

*ڕۆژنامە نووس : فیلمەکانت دەربارەی زەبرو زەندن، پاشان ئەوە پیشان دەدەن کە زەبرو زەند تێکدەرەو ماڵ وێران کەرە. ئایا دەتوانن خەباتی سیاسی بێ زەبرو زەند بەرپا بکەن؟*

یەڵماز : زەبرو زەند گەر دەمامك‌و چارشێوی پێشکەوتنخوازانەو شۆڕگێڕانەش بپۆشێ هەر تاوانەو ماڵ وێران کەرە.

ڕۆژنامە نووس : کەواتە تیرۆریستی‌یە؟

یەڵماز : بەڵێ تیرۆرستی‌یە، تەنها یەك زەبرو زەند ڕەوایە، ئەوەی دژی زەبرو زەندو چەوساندنەوەیە، بەومەرجەی زۆربەی گەل پێی ڕازی بێت.

*ڕۆژنامە نووس : ویست‌و توانا‌و کەسایەتی سەرکردەیەکتان تێدایە - ناتانەوێ ببنە سەرکردەو ڕابەری ئەو بزوتنەوەیەی خەریکی هێنانە کایەیین؟*

یەڵماز : ئەوە ئامانجی من نی‌یە.

*ڕۆژنامە نووس : بەڵام گەر پێویستی کرد سینەما بۆ سیاسەت بەجێ دەهێڵن؟*

یەڵماز : یەکسەر کە هەلی لەبار هاتە پێش ناتوانم بڵێم بەیارمەتی دەبێ جارێ فلیمێك دەربکەم. دوای ئازادی سەدان (یەڵماز گۆنای) دێنە کایەوە کە گوڵی نوێی کولتورەکەمان شکۆفە پێ دەدەن.

*ڕۆژنامە نووس : بەهۆی هەڵهاتنتەوە هەست ناکەیت لەجۆرە بەندیخانەیەکی دیکەدا بیت؟ چۆن بەبێ ئیقامە، لەجێگەیەکی تا ڕادەیەك هەمیشەیی یابێ جنسیە هەڵدەکەیت؟*

یەڵماز : بەو جۆرە دەژیم کە دەیبینی. لەمانگی مایس دا داوەت کرام بۆ بەشداری لە ڤیستڤاڵی (کان)دا، ڤیزەی سەفەرێکی فەرەنسام پێ درا، سێ‌هەم ڕۆژ لەسەر داوای ڕژێمی تورکیا لە فەڕەنسا دەرکرام. بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە جارێکی دی ڤیزەی بیست‌و چوار کاژێریان پی‌دام.

*ڕۆژنامە نووس : خەڵاتی دارخورما زێڕینەکەتان بەدوو پەنجەی نیشانەی سەرکەوتنی شۆڕشگێڕانەوە بەرزکردەوەو ئیدی وون بوون.*

یەڵماز : ئەو داوەتەی (کان)م (میوانی شەرەفی) سۆسیالیستیەکانی فەرەنسا بووم، ئیدی نەمویست تەنگوچەڵەمەیان بۆ بسازێنم.

*ڕۆژنامە نووس : هیچ کات لەئەڵمانیای ڕۆژئاوا بوویت؟*

یەڵماز : نەخێر. پێش چەند مانێگ وەزارەتی داد لە (بۆن) ئاگاداریان کردم کە هیچیان دژی من نی‌یە، یانی فەرمانی گرتن‌و شتی وا، بەڵام کاتێ لە زیوریخ چوومە باڵوێزخانەو داوای ڤیزەی سەردانم کرد، بەئاشکراو بەئاگاداری (بۆن) داواکەم درایە دواوە. وا پێدەچێ لەم کاتەدا هیچ یەکێك لەووڵاتانی ئەندامی (ناتۆ) نە ڤیزەو نە ئیقامەم پێنەدەن.

*ڕۆژنامە نووس: دەی سا چۆن دەبێ، چۆن دەتوانی بەبێ جێ‌و ڕێگەیەکی‌ئەوتۆ بمێنیتەوەو فیلم دەربکەی؟*

یەڵماز : ئەوەی دەیکەم ئیسپاتی دەکات کە دەتوانم. من لەبارو دۆخی زۆر لەمە نالەبارتردا کارم کردووە.

*ڕۆژنامە نووس : ئەم چاوپێکەوتنەمان لەڕێگەی خەڵکی دی‌یەوە سازکراو ئاسان نەبوو، پاساوانەکانت هەنگاو بەهەنگاو بە دووتەوەن‌و والەو دیوەوە بە ووریایی دانیشتوون. ناوەکەت (یەڵماز)ە یانی (نەترس)، ئایا هەست بەوە دەکەن کەلە خەتەردان؟*

یەڵماز : بێ‌گومان دەبێ حسێب بۆ فڕاندن یاخود هەوڵێکی کوشتن بکەن. لەخەتەردام بەڵام ترسم نی‌یە.




***لە گۆڤاری (کاروان- ژمارە15ی ساڵی 1983) بڵاو کراوەتەوە.**

***کوردۆ (د. کوردۆ عەلی)یەو ئێستا مامۆستایە لە زانکۆی سلێمانی.**

# سیناریۆی فیلمی مێگەل

**کوردۆ**

**لەئاڵەمانیەوە کردوویەتی بەکوردی**

**پێشکەشە بە:**

- **گیانی شەیدای ئەو یەڵماز گیونایە هونەرمەندە هەڵکەوتووەی کەدەستی قەدەر بەکوردی رەوا نەبینیو لەتروکی بەخشش و داهێناندا مەرگ سوژدەی بۆ بردو لیّی شاردینەوە.**
- **بەگیانی بەهرەمەندانەی "رەفیق چالاك"ی هونەرمەند، یەکێك لەرێبەرە دانسقەکانی شانۆی هەژارانەی کورد.**
- **بەگیانی "فەریقە کوێر" ئەو هونەرمەندە نەخوێندەوارە بلیمەتەی، ژیانی تاڵ و پڕ مەرگەساتی کوردەواریی بەخەندەو پێکەنین سواخدەداو تامردنی وەك پێویست رێزی لیّ نەنرا.**
- **بەگشت هونەرمەندە لیّ وەشاوەکانی نەتەوەکەم.**
- **بەو دەزگەیەی ئەم فیلمە شاکارەمان بەکوردی بۆ دۆبلاژ دەکات.**

- **سەرەتا**

سەرەتای فیلمەکە بەو گۆرانییە بەسۆزە خەمناکە دەست پیّ دەکات کە(راڤنیّ) دەیچرێنێت.

لەو کاتەدا کەوێنەی سروشتی نێوچەکە نیشان دەدرێت، سیّ سوار هێواش هێواش بەدووییەکدا ریّ دەکەن. ئەوانە سیّ کورەکەی تیرەی (حالیلان)ن، نێچیرەڤان، باران، راڤنیّ.

رووخساری ماندوو لەشی ئارەقاویی خۆیانو ئەسپەکانیان ئەوە نیشان دەدەن کەلەمێژە بەرێگەوەن.

یەکەم وێنەی سەرەتا، نیشانەی رابوونی تەنهایی مرۆڤە لەژێر خێوەتی ئاسماندا لەقتەیەکی دووری ئاسمانێکی ساوو لەبەریەك رەواندنەوەی چەند پەڵەهەورێك، دیمەنێکی دلۆڤان و شاعیرانە نیشان دەدەن.

لەگەڵ کۆتایی گۆرانییەکەدا سەرەتای فیلمەکەش کۆتایی دێت و هەرسێ سوارەکە لەسەر گردۆڵکەیەك رادەوەستن. بزووتنی ئەسپەکانو کەسەکان هێواشن. تفاقی ئەسپەکانو جلو بەرگی پیاوەکان نێوچەیین.



گشت کەلوپەلەکان کۆنەنو ئەوە نیشان دەدەن کەزۆر بەکارهاتوون. هەرسیّ براکە لەلەقتەیەکی نیزیکدا بەشێوەیەکی وانیشان دەدرێن کەکارەکتەریان دیار بخات.

نێچیرەڤان- بیردەکاتەوە، رەنگ بزرکاوە، مرۆڤێکی هێمنو لەسەرخۆ دیارە، وایێ دەچێت لەخەیالی چارەسەرێکدا بێت.

باران- روویەکی گرژو مۆن، دەمو چاوێکی چرچ و لۆچ، بیّ دەنگە بەڵام ئالۆز.

راڤنیّ- تورەیە، لاجانگەکانی دەبزوون، چونکە خووی گرتووە هەمیشە ددانەکانی جیڕدەکاتەوە.

لەسەر گردەکەوە دەروانێنە ئەو گوندەی لەپێنج شەش ماڵێك پێکهاتووە.

لەنێزیکی گوندەکەوە چەند خێوەتێك هەڵدراون.

((پێویستە -ئەگەر لەدووریشەوە بێت- بە لەقتەی زۆر کورت کێڵانی زەویی نیشان بدرێت، بەڵام بەبەرزی بێت))

((پێویستە ئاوازی گۆرانییەکە پاشانیش جارجارە دووبارە بکرێتەوە، تاتامەزرۆیی دیداری "بێریڤان"و کەس و کارەکەی نیشان بدات))

2- **گوندی شێخی رەش:**

وێنەی ئاشێك، لەقتەیەکی گەورەتر، خانوییەکی بەرد، گوندێکی گچکەی لەچەند خانوویەك پێکهاتوو، کپ و بیّ دەنگە.

3- **لەبەردەم ماڵی شێخی رەشدا**

سیّ چوار منداڵ لەبەردەم خانووە بەردینەکەدا یاری دەکەن. چەند ژنێك منداڵەکانیان بەکۆڵەوەیەو لەبەردەم ماڵەکەدا رۆنیشتوون. بەردەمی ماڵەکە لەبەردەمی نەخۆشخانە دەچێت. ژن و پیاو بەکۆمەڵ دانیشتوونو چاوەریّ دەکەن. نەخۆش، کوێر، پەککەوتە، پیری گالۆك بەدەست.

سیلۆ- تەمەنی شازدەساڵە، لەهۆزی (ڤەیسیخانی)یە. لەپاڵ دیوارە بەردینەی ماڵەکەدا خۆیداوە بەسەر لوولەی تاپرەکەیدا. لەلەقتەیەکدا (سیلۆ) شتێك لەدوورەوە بەدی دەکاتو زیت دەبێتەوە. چاوەکانی دینێتەوەیەك و بۆدوور دەروانێت و خۆی بۆ پێشەوە دەچەمێنێتەوە، لەپڕ هەست دەکات چی دەبینێت. هەرسیّ سواری سەرگردەکە لەلەقتەیەکی نێزیکدا بەدیدەکات. پاش ووردبوونەوەیەکی تەواو، گومانی نامێنێت، (حالیلانی)یەکان دەناسێتەوە. (حالیلانی)یەکان دوژمنی تیرەی (ڤەیسیخانی)ین.

سیلۆ بەهێواشی راست دەبێتەوە، وەك بیەوێت سوارەکانی سەرگردەکە هەست بەجووڵەی نەکەن، خۆی دەکات بەدەرگەی خانووە بەردینەکەدا.

4- **لەماڵی شێخی رەشدا**

ڕەنگ و بۆن و بەرامەی سەدەکانی نێوەڕاستی پێوەدیارە. وێنەی عەنتیکەو شێوەو شێوازی سەیر نیشان دەدرێن. شێخی ڕەش لەبارەی نەخۆشی یەکانی (بێریڤان)ی ژنی (سیڤان)ەوە دەدوێت. بێ دەنگی یەکە بەبلمە بلمی نزای شێخ دەشلەقێت. ئەودەمەی شێخی ڕەش بەشێوازێکی تایبەت نزادەکات، بێریڤان لەسەر چۆک هەڵتووتاوەو بێ جووڵەو بێ دەستەلاتانە چاوی شۆڕکردۆتەوەو گوێ ڕادەهێڵێت.

بێریڤان- تەمەن هەژدە ساڵان بەرەو ژوورە. هەرچەندە زۆر ژیکەڵە نییە، بەڵام خوێن‌شیرنەو دەم و چاوی سادەو ساکارو تێک قوپاوە. لاوازو شەرمنۆکەیە. (سیڤان)ی مێردی لەسوچێکی دوور، لەنێزیکی دەرگەکە چیچکەی کردووەو بێ جووڵە دەڕوانێتە هەردووکیان.

سیلۆ بەئەسپایی و لەسەرەخۆ دێتە لای سیڤان و شتێکی بەگوێدا دەچرپێنێت. سیڤان ماوەیەکی قەتیس دەمێنێت و بیر دەکاتەوە چ بکات. بەهێواشی ڕاست دەبێتەوە تاسەر لەشێخ تێک نەدات. بەرەو پەنجەرەکە دەڕوات و لەوێوە دەڕوانێتە دەرەوە.

## 5- تێڕوانینێك لە پە نجەرەکەوە

یەکەم شتێك کەدەیبینێت، هاتوچۆی چەند ژنێکە کەمنداڵەکانیان دەگێڕنەوە سوارەکان نابینێت، بەڵام بەشڵەژاوی ی خەڵکەکەدا دیارە نێزیکن.

## 6- ماڵی شێخی ڕەش

پاش ئەوەی سیڤان کەمێك بیردەکاتەوە، شتێك بەگوێی سیلۆدا دەچرپێنێت، سیلۆ چۆن بەهێواشی و لەسەرەخۆیی هات، هەرئاواش دەگەڕێتەوە. لەودەمەدا کەوێنەی دەرەوە نیشان دەدرێت و لەقتەیەکی گەورەی دەم و چاوی سیڤان دێتە پێش، چپەچپی نزای شێخ دەبیسترێت. شێوەو شێوازی نزاکە بەجۆرێکە کەئالۆزی بارەکە دەردەخات.

((دەتوانرێت ئەم لەقتە کورتانە بەشێوەی دی نیشان بدرێن، بۆنموونە دەشێت لەبری شێخ دەروێشێك بێت، لەم حاڵەتەدا دەتوانرێت دەف لێبدرێت و سروودی ئاینی بخوێندرێت. دەتوانرێت تەلیسم و سیحر نیشان بدرێت. دەتوانرێت بێریڤان بەتەنها چارەسەر بکرێت. نزا لەسەر سکی بنووسرێت. ڕەنگە ئەمەیان شیاوتر بێت تالەگەڵ هەڵوێستی دواتری بێریڤاندا بگونجێت کاتێك ڕێگەی پزیشکەکان دەدات فەحسی بکەن)).

## 7- لەبەردەم ماڵەکەدا

تا سیلۆ دێتە دەرەوەو بۆ گردەکە دەڕوانێت، کەس بەگردەکەوە نەماوە. سیلۆ بەشڵەژاوی بەنێوخەڵکەکەدا بەرەو هێسترەکەی ملدەنێت کەبەدارێکەوە بەستراوەتەوە. بەوریایی یەوە سەرنجی دەوروبەری خۆی دەدات وانیشان دەدات کەدەخوازێت بزانێت سوارەکان چی یان بەسەرهات. ڕەشمەی هێسترەکەی دەکاتەوەو بەهەمان وریایی یەوە بەرەو دەرگەکە بەکێشی دەکات. هەڵس وکەوتی ئەم خەڵکەکە زێتر دەشڵەژێنێت. ئەم ڕەفتارو دەم و چاوانەی شڵەژاوی یەکە بەدیاردەخەن یەکەیەکە پیشان دەدرێن.

سیلۆ لەبەردەگەکەدا دەچێتە پشت ولاخەکەیەوە، بەشێوەیەکی وا کەدیار نامێنێت. لەوسەری خانوەکەوە دەچێتە پارێزەوە. لەپڕ دەبینێت وا سوارەکان لەوبەرەوە بەرەو ڕووی دێن. دەپەشۆکێت. کاتێك سوارەکان بەدەردەکەون، خەڵکی بۆخۆپارێزی دەکشێنە کەنارەوە.

((لێرەدا دەبێت خۆ لەلەقتەی کاوبۆیانە بپارێزرێت)).

کەمێك دواتر سیڤان لەپێشەوەو بێریڤان لەدوویەوە دەدیترێن. سیڤان سوارەکان بەدی دەکات. لەپێش دەرگەکەدا هەڵوێستەیەکی بۆ دەکات. ژنەکەی لەسەرەخۆ دەچێتە پشتی یەوە. لەبەرئەوەی ناتوانێت لەسەر شانی مێردەکەیەوە بڕوانێت، سەری بەلای ڕاستدا لاردەکاتەوە، چونکە سیڤان کەتەو باڵابەرزەو بێریڤان کورتو لاواز.

سیڤان بێ ئەوەی ڕووی خۆی لەسوارەکان وەرگێڕێت، سواری هێسترەکەی دەبێت. بەکۆمەکی سیلۆ ژنەکەشی سەردەخات و لەپشتی خۆیەوە سواری دەکات.

نێچیرەڤان: کاکە سیڤان!

سیڤان بەسەرسامی یەوە، بێ ئەوەی چاوەکانی بتروکێنێت دەڕوانێت تابزانێت چ دەڵێت.

نێچیرەڤان: کاکە سیڤان، بۆ ئەوە هاتووین دوو قسە لەگەڵ بێریڤاندا بکەین.

نێچیرەڤان: چاوەڕوانی وەرامی سیڤان دەکات، بێ ئەوەی بیرلەوە بکاتەوە کەرەنگە بێدەنگی یەکەی سیڤان بەشێوەیەکی خراپ بتەقێتەوە، بەدەنگێکی دۆستانە دەیدوێنێت.

نێچیرەڤان: سیڤان تۆ مرۆڤێکی ژیریت و دیارە تێدەگەیت دەردی دووری یانی چی. ئێمە پێتدا رادەپەڕمووین، چونکی دەزانین لەخانەوادەی ڤەیسی خانی دا تەنها تۆ تێگەیشتوویت.

سیڤان نازانێت چ بکات، دڵی خەریکە هێلانەی لەشی جێ دەهێڵێت، ویژدانی ئازاری دەدات، بەڵام لەبەر سیلۆ ناوێرێت هیچ بڕیارێك بدات.

نێچیرەڤان: سیڤان، بێریڤان خێزانی تۆیە بڕیار بەدەست خۆتە، دەبێت ئەوە بزانیت کەئێمە هەموومان گیرۆدەی یەك دەردین.

سیڤان بەبێدەنگی و حەپەساوی تێی دەڕوانێت، نێچیرەڤان نەرم و ژیرانە دەدوێت، بەهیوای ئەوەی دڵی نەرم بکات.

نێچیرەڤان: سیڤان ئێمە تۆ لەبێریڤان هەڵنابوێرین، داخمان گەلەك زۆرە! تکایە ڕێگەمان بدەن تەنها کەمێك لەگەڵ خوشکەکەمان بدوێین.

بێریڤان بەبێدەنگی چاوەڕوانی بڕیاری سیڤانە. سیلۆ دێتە گۆ، چونکە هەست دەکات کەسیڤان خەریکە شل بێت و بڕیاری ناقۆڵا بدات.

سیلۆ: نەکەیت، ڕێگەیان نەدەیت، ئەوانە براکانیان کوشتووین.

نێچیرەڤان: سیلۆ ئێوەش براو ئامۆزاکانی ئێمەتان نەکوشتووە؟

ئێمە دانمان بەخۆدا گرتووە، ئازارەکانمان لەگەڵ کوژراوەکانماندا ناشت، ئێمە داوای ئاشتبوونەوەمان کرد، ئێوە ڕازی نەبوون، ئێمە دۆستایەتیمان ویست و خوشکی خۆمان پێدان. ئێوە بەپێچەوانەوە، سوێندتان لەسەر دوژمنایەتی خواردووە، خوێن ڕشتن بەس نی یە؟ هێندەمان خوێنی یەکدی ڕشت خەریکە هەردوولامان تێیدا دەخنکێین.

((لەکاتی ئەم گفتوگۆیانەدا دەتوانرێت جۆرەها لەقتە بەکار بهێنرێت))

نێچیرەڤان رووی لەسیڤان دەکاتەوە...

نێچیرەڤان: سیڤان بەویژدانت درۆ دەکەم؟ ئەگەر وانییە بڵێ. هەموو بەئازار رازیبوون، ئێمە ئازاری دیکەمان نەویست، خوشکەکەمان بەتۆ دا. ئێمە ئاشتیمان خواست، گوتمان دەبێت ئەم تۆڵەسەندنە کۆتایی پێ بهێنرێت. بەحسێبیبووینە خزم، برا، چووزانم، ئێمە وامان زانی، بەڵام حامۆی بابت هەمدیسان هەمووی تێکدایەوە. هەمووی هەڵوەشاندەوە. سیڤان بەویژدانت بڵێ چ کەڵکێك دەگرێت! بۆ چەکدارمان دەنێرێتە سەر؟ لەپێناوی چیدا؟ بۆ خوێنی دیکە برژێت؟ بۆ ئەبوزەری فێگرتوو پەلامارمان دەدات؟ بڵێ، دە بڵێ، بێریڤان تاوانی چییە؟ گەر تاوانێکی هەیە بۆ گلت داوەتەوە، بۆ پارێزگاریی لێ دەکەیت؟

سیلۆ دەقیژێنێت، وەك بیەوێت تەوژمی گوتەکانی نێچیرەڤان لەبیری سیڤاندا بسرێتەوە...

سیلۆ: لەگەڵیان نەدوێیت، یەك ووشە نەڵێیت، برۆ با برۆین، قسەی لووست بۆ دەکەن، برۆ بابرۆین.

نێچیرەڤان: وەرە کاکە سیڤان گوێمان بۆ راهێڵە. وەکو بابت مەکە، وەکو براکانت مەکە، ئەوانە منداڵن، نەفامن، گەوجن.

سیلۆ: ئەو قسانە مەکە!

نێچیرەڤان: گوێ بۆ دڵت راهێڵە. ئەگەر لەسەر رێچکەی بابت برۆیت بۆ هەموومان خەراپە، خێزانمان بێوەژن دەبن، منداڵمان هەتیو دەکەون! ئەم هەموو بێوەژن و هەتیو کەوتنە بەس نییە؟

بیرکەرەوە، منداڵێك بە چ کوێرەوەرییەك دەبێتە پیاو، گوڵلەیەکی گچکە. دەستێك کەلە پەلەپیتکەیەك گیردەکرێت دەیدات بەزەویدا! ئایا ئەوە شێتی نییە؟

سیلۆ: بڕوا بەزمانی چەوتیان نەکەیت، زمانیان بەسەرزارەکی شیرینە، وەکو دی ژاری تێدایە! مەهێڵە دەم هەڵهێننەوە، دوژمنمانن، لەیادت نەچێت، براکانیان کوشتووین، لەیادت نەچێت.

سیڤان لەپڕێکدا دەژەنێتە ولاخەکەی، ولاخەکەی تەکانێك دەدات...

نێچیرەڤان: کاکە سیڤان راوەستە، گوێ راهێڵە، رێمان بدە کەمێك لەگەڵ خوشکەکەمان بدوێین.

سیڤان هێسترەکەی دەئاژوێت. بێریڤان ئاورێك لەبراکانی دەداتەوە، بەروویەکی خەمناکەوە بێ دەسەڵاتانە تێیان دەروانێت. مل بەلارەوە دەگرێت و ئەوە نیشان دەدات کەخۆی داوەتە دەست چارەنووس..

باران، برای نێوەنجی بەدەنگێکی هەراش هاوار دەکات...

باران: بێریڤان، خوشکەڵێ، ئازابە، وورە بەرمەدە، ئێمە ئامادەین ژیانمان لەپێناوتدا بەخت بکەین. حالیلانێ یان دەست بەردارنابین.

سیڤان دووردەکەوێتەوە.. سیلۆ بەدوویدا هەنگاوی خێرا هەڵدەگرێت، جارجارە بەترسەوە ئاورێك دەداتەوە، بەپەلەو توورەیە...

رووداوو گوتەکان کار لەخەڵکەکەی بەرماڵەکە دەکەن...

باران بۆ دواجار دەقیژێنێت...

باران: بێریڤان، ورەبەرمەدە! نەهێڵیت تێکت شکێنن، خوشکەڵێ! خەمو خەفەت هەر کۆتایی پێ دێت! باوەرت بێت رۆژێك دێت ئەوانەی ئێستا ئازارت دەدەن، لەوکارەیان پەشیمان دەبنەوە، شەرمەزاردەبن!

تادێت سیڤان دووردەکەوێتەوە.. راڤنێی براگچکە وەك پەیکەرێك لەشوێنی خۆی چەقیوە. بەرقەوە دەروانێت و تەنها لاجانگەکانی دەبزوێن..

### 8- حەواندنەوەیەك

نێچیرەڤان و باران چیچکەیان کردووە، راڤنێ وەستاوەو هەر دەروانێتە سیڤان و سیلۆ کەخەریکن وەك خاڵێك لەدوورەوە گوم دەبن.. دیارە ماوەیەك دوویان کەوتوون و لەبێرەدا لایان داوە.. ئەسپەکانیان بەدارێکەوە بەستۆتەوە..

پاش بێ دەنگییەك، راڤنێ روو لەبراکانی دەکات..

راڤنێ: ئیدی ئاشتی لەبیر بکەن. ئاشتی نەما. تا حامۆ لەژیاندا مابێت پیاو ناتوانێت بەئاشتی لەگەڵ ڤەیسی خانیدا بژێت!

باران: پێویستە حامۆ لەنێو ببرێت، کوشتنی نابێت دوابخرێت.

دیارە نێچیرەڤان رای براکانی بەگەن ناکات و جۆرێکی دی بیردەکاتەوە.. راڤنێ ناتوانێت بەسەر توورەبوونی خۆیدا زاڵ بێت..

راڤنێ: ئایا تا دوژمن لەژیاندا مابێت، دوژمنایەتی کۆتایی پێ دێت؟ دوژمن هەر دوژمنە! خوێن جارێك دەرژێت.. کارێکی دیکەمان لەدەست نایەت، یا دەبێت ئێمە بمرین یان ئاوان، تا پیاوێك مابێت و خوێن لەگیانیدا بێت دەبێت خوێن برژێت، ئەمە نەریتە، چارەیەکی دی نیە. ئێمە هەر لەسەرەتاوە هەڵەمان کرد. باوەرمان بەدوژمنی خوێنەخۆری خۆمان کرد.. بۆ؟ دوژمن گۆراون؟ بوونەتە دۆست؟ گورگ بۆتە دۆستی مەر؟.. ئەمانە خەونی پرووپووچن. کاتی خۆی بەگوێی منتان نەکرد! پێتان وابوو منداڵم..! پێم نەگوتن؟ ئەوەتا کەدەیبینین! ئایا پێشەکی نەماندەزانی کەحامۆ چ نامەردێکە؟ دەتوانین بڵێین رێککەوتووین و ئاشت بووینەتەوە؟ بێریڤانمان دانێ و گوتمان ئیدی رێك کەوتین! چ رووی‌دا؟ تەنها بێریڤانمان خستە باخەڵی دوژمنەکانمانەوە، کردمانە قوربانیی، وابوو، گوتمان ها خوشکەکەمان بۆ ئێوەو ئیدی لێمان گەرێن. لەراستیدا ترسنۆك بووین، ترسنۆك! تۆڵە لەدڵی حامۆدا مەودایەکی بێ سنووری هەیە. ئەو جەردە پیرە رق لەدڵی دەردەچێت؟ قەت لەبیری ناکات. گەر بشمرێت لەداخی تۆڵەدا درك و پەلکی ژاراویی لەسەر گۆرەکەی شین دەبن! پێتان دەڵێم خوشکەکەمان لەو رێیەدا تێ‌دەچێت! صەد حەیف و مەخابن...

((دەتوانرێت لەکاتی گوتەکانی راڤنێدا ئەو وێنانە پیشان بدرێن کەپاشان لەکاتی گفتوگۆی شارۆچکەکەدا نیشان دەدرێن. جۆرە وێنەیەکی سوریالی لەنێوان ئێستاو پاشەرۆژدا، لەنێوان ئاوات و زیندەخەوندا، رەنگە زۆر کاریگەربن)).

راڤنێ ئازاری باری ناهەمواری خوشکەکەی دەچێژێت، ئاو لەچاوەکانی زاون.

ڕاڤنی: کیژۆڵەیەکی ناسکی چواردەساڵانمان کردە قوربانیی لەپێناوی ئاشتیدا، گوومان خواردبایە!

نێچیرەڤان: چ بکەین؟ گشت ڤەیسیخانییان بکوژین؟

ڕاڤنی: ئەدی چارەیەکی دی هەیە؟ هەیە؟ پێم بڵێ گەر هەیە!

نێچیرەڤان پەشێوی براکەی هەست پێدەکات، هەوڵ دەدات هێوریکاتەوە.

نێچیرەڤان: ئاشتی شتێکی چاکە، بارێکی چاکی بۆ هەردوولا دەڕەخساند، چاك دەبوو گەر سەریگرتبا، بەڵام سەرینەگرت. تا ئەمڕۆ هەر لەیەکدیمان کوشتووە، چمان دەستگیربووە؟ ئاشتی هەلێکی چاك بوو، بەڵام سەری نەگرت، قۆرتی هاتەڕێ. ڕەنگە گەر بێریڤان منداڵێکی بۆ ماباو هەموویان نەمردبان، ئەمانە ڕوویینەدابا.

باران: منداڵو شتی وا بەهانەیە! مردن خۆیمان تێ هەڵدەسوێت! ئەم بەهانانە سەرئێشەن! تاوانی هەرهەمووی لەئەستۆی حامۆدایە. ئایا ئەوان نازانن بێریڤان نەخۆشە؟ پێویستە حامۆ بتۆپێندرێت...

ڕاڤنی: دەبێت حامۆ لەنێو ببرێت، هەموو ئەوانی دیکەشیان..

نێچیرەڤان: سیڤان زاوامانە، ئەو لەگەڵ ڕێکەوتندایە، تەنها کەسێکە کەبێریڤان لەڤەیسیخانییان دەپارێزێت. لەبەردەم گشت توڕەییەکی ڤەیسیخانییاندا خۆی ڕاگرتووە. خوشکەکەمان دەپارێزێت. ئەو بەزوڕنای ئەوان هەڵناپەڕێت. ئێوە کوێرن؟

ڕاڤنی: دەی سا بۆ ڕێی نەداین لەگەڵ بێریڤان بدوێین؟ پیاو چۆن ئاوها ڕێك دەکەوێت؟ ئەمە چۆن ڕێککەوتنێکە؟ چۆن پشتگیرییەکە؟

نێچیرەڤان: هەندە ناچارییەك هەن، مرۆ هیچی لەگەڵ پێ ناکرێت. ئەو ئەگەر دوژمنیشمان بێت خزممانە، مێردی خوشکمانە. گەر بەگوێی حامۆی کردبا، لەمێژبوو بێریڤانی باوەخون کردبووەوە. ئەوەش دەبووە لەکەیەکی گەورە بەشانی ئێمەوە. نەیکرد، دژی هەرهەموویان وەستایەوە!

باران: دەسا کەوایە چ بکەین؟

نێچیرەڤان: دەبێت سەرلەنوێ هەوڵ بدەینەوە لەگەڵی بدوێین.. قۆمیسەرێکی نوێ هاتووە، دەچینە کنی، دەچینە لای باسری ڕۆژنامەنووس، دەڵێین مەسەلەکە ئابەو جۆرەیە.

## 9- دەوارەکان و مێگەلەکە لەنێزیکیانەوە

حامۆی ڤەیسی خانیو ئەبوزەڕ لەدیار مێگەلەکەن..

(لەقتەیەك، حامۆ لەنێوەندیدایە)..

هەوڵ دەدەن مێگەلەکە بەرەو دەوارەکان



بئاژوون. دەنگی تایبەت بەئاژووتنی ئاژەڵ دەردەبڕن. هێندێك مەڕ بەنێوی تایبەتییەوە بانگ دەکەن.. حامۆ بەهێزو توانایەکی واوە کەلەو تەمەنەدا لێی چاوەڕوان ناکرێت، بەرد دەگرێتە سەگەکەو تێی دەگەیەنێت مەڕەکان بەرەو کوێ ڕابدات.. بەجموجۆڵیدا هەست بەتوڕەییو کەللەڕەقی دەکرێت.

سەگەکە لەبەرد هاویشتنەکە ڕا تێدەگات حامۆ مەبەستی چییە.. باعەی مەڕەکان دەنگی زەنگۆڵەی ملیان، فیکەی پیاوەکان، سیمفۆنیایەکی هێجگار دڵگیر پێك دەهێنن.. لەو بوومەلێڵی ئێوارەیەدا تەپو تۆزی پاش مێگەلەکە تیشکێکی زیوین دەنەخشێنێت.. بێری لەدەوارەکان دێنەدەرێو ڕوو لەمێگەلەکە دەکەن. بەمەنجەڵو سەتڵو کترییەوە بۆ مەڕدۆشین دەچن.

هەردوو ژنەکەی حامۆو ژنەکانی ئەبوزەڕو سیلۆشی لەگەڵدان. شەنگەبێرییو مەڕەکان لەجێبێریدا پێك دەگەن. بێی بەدووی مەڕدا ڕادەکەن. منداڵێکی زۆر لەو دەوروبەرە خڕبوونەتەوە، هەتا منداڵی شیرەخۆرەیشیان لەنێودایە.

لەودەمەی هاواری ئەبوزەڕ دەبیسترێت، پەرکەم گرتوویەتی، ژنەکەیو حامۆ بۆلای ڕادەکەن.. ئەبوزەڕ ڕەپ بووەو دەمی کەف دەچەنێت. کاتێك حامۆ هەوڵ دەدات لەپی بکاتەوە، ژنەکەی سەلکەپیازێك لەخورجەکەی دەردەکاتو توند بەزەویدا دەکێشێت تا بیقڵیشێنێتو بینێت بەبەر لوتییەوە.

لەودەمەدا حامۆ، سیڤانو سیلۆ بەهەڵەداوان بەرەو مێگەلەکەو حامۆ ڕادەکات.

هەرچەندە حامۆ لەپی ئەبوزەڕی گرتووە تا نەنوقێت، بەڵام هۆشی لای سیلۆیە. سیلۆ ڕادەکات، ژنەکەی ماتیکەرە[1]. دەموچاوی حامۆ گومانی لێ دەتکێت.

## 10 – دەوارەکان

گەڕانەوەی سیڤانو بێریڤانو خەڵکەکەی دەوروبەریان هیچ ناهەژێنێت. هەر کەسە سەرگەرمی کاری ڕۆژانەی خۆیەتی، هەروەکو هیچ ڕوویینەدابێت. مرۆ هەست بەوە دەکات کەسیڤانو بێریڤان تەواو تەنهاو کەنارگیر دەژین. نێوچەوانیان نیشانەی دیتنی حالیلانییانی پێوەدیارە. سیڤان بێریڤان لەسەر زینەکە دادەگرێت، خۆشی دادەبەزێت.. لەدوورەوە دەبینێت حامۆو سیلۆ گوتەکانی بەدەستو باڵ بزواندنەوە دەگێڕێتەوە. سیڤان تێدەگات کەسیلۆ دیتنی حالیلانییان باس دەکات.

لەدوورەوە دەبینێت واحامۆ شێتگیرانە سیلۆ ڕاودەنێتو گۆچانەکەی لێ هەڵدەسوڕێنێت. دەیگرێت، چەند شەپێکی تێدەسرەوێنێت. دەینێتە ژێر

خۆی، ئەوانی دی رادەکەن لەژێر چنگی رزگاری دەکەن.

سیڤان تێدەگات ئێستا چ ڕوودەدات. هێسترەکەی توند دەبەستێتەوە.. بێریڤانیش دەزانێت ئێستا ڕەنگە خراپ بقەومێت. بەپەژارەوە لەسیڤان دەڕوانێت. نەمامەکەی بەردەم دەوارەکە ئاودەدێرێت.

حامۆ بەپەلە دێت..

سیڤان هەوڵ دەدات ئارام بێت، خۆی لەگەڵ شتێکدا خەریك دەکات... بێریڤان ئاوو دان دەخاتە پێش کەوەکان...

حامۆ: گەر نێچیرەڤانێکی حالیلانی، سیڤانی ڤەیسی‌خانی لەیەك گۆشت و خوێن حسێب بکات... گەر دوژمنێك بەدوژمنەکەی بڵێت تۆ مرۆڤی چاکیت و لەتۆ چێتر پەیدانابێت.. گەر دوژمنان بەیەکێکدا هەڵبدەن، دەبێت زۆر بەراشکاوی بیر بکەیتەوەو بزانیت ئەوە چۆن مرۆڤێکە!

سیڤان نایەوێت لەوبارە ئاڵۆزەدا لەگەڵ بابی‌دا بکەوێتە دەمەدەم، چونکە دەزانێت لەکوێوە قسەدەکات، مەبەستی چی‌یە! هیچ چارەیەکی نی‌یە لەوە زێتر کەگوێی خۆی بخەفێنێت و بەخوێن ساردی‌یەوە وەری‌گرێت. ئەم خوێن‌ساردی‌یە حامۆ شێتگیرتردەکات.

بێریڤان لەکەلێنێکی دەوارەکەوە دەڕوانێتە ئەم گفتوگۆیەی باب و کوڕەکەی...

حامۆ: دوژمنی ژیر، دڵی دوژمنی خۆی دەسمێت. حالیلانی‌یان وادەکەن. حالیلانی دوژمنی ڤەیسی‌خانی‌ین... بۆدەبێت دوژمنان بەدوژمنی خۆیاندا هەڵدەن، سیڤان بۆ؟

بەیەکجارەکی بەڕوویدا دەتەقێتەوە...

حامۆ: بۆ سەرو گوللەتان نەنا بە نێوچەوانیانەوە؟ بۆ خاکتان بەخوێنیان سوور نەکرد؟ بۆ؟

لەم کاتەدا بێریڤان دەبینێت کەلەکەلێنێکی دەوارەکەوە سەیردەکات..

حامۆ: پێویست وابوو تۆش بەهێز بیت، تواناو هەڵوێستت هەبێت! دژی کێ بەتواناو بەهێز بیت؟ دژی ئێمە، دژی ڤەیسی خانی، دژی منداڵەکانی ڤەیسی‌خانی کەلەسکت‌دا دڵڕەقانە لەنێوت بردن! ئۆ خودا، خودای مەزن، چ تاوانێکمان کردبوو وا دوژمنت لەنێوجەرگەماندا چاند؟

بێریڤان دەکشێتەوە نێو دەوارەکە. حامۆ رووی دەمی لەسیڤان دەکاتەوە. ماوەیەك بەو توڕەیی‌یەوە رادەوەستێت، بێ ئەوەی بزانێت چ بڵێت...

حامۆ: شورەیی‌یە لێیان ترسایت، سیڤان! لەپێناوی ژنێکدا خوێنی ڤەیسی‌خانی‌یانت فرۆشت!

سیڤان: ژنێك نی‌یە، خێزانمە، بابە! بێریڤان خێزانمە، بووکتە، شەرەفی خانەوادەکەمانە!

حامۆ: شەرەفمان نی‌یە، بەڵکە لەکەی عەیب و عارە بەخانەوادەکەمانەوە. کچە




حالیلانی هەر بۆ سەرەنوێڵکی حالیلانی‌یان چاکن! براکانی براکانیان کوشتووین، منداڵەکانیان کوشتووین. خوشکەکەشیان هەمان تەرسە، چونکە هەمان خوێن بەدەمارەکانیدا فڕکەدەکات! بۆیە منداڵەکانیشی لەبار خۆی دەبات. وەچەی لێمان ناوێت... سوێندی خواردووە نەهێڵێت منداڵی لێمان بکەوێتەوە. بیربکەوە، بۆ؟ چونکە بێریڤان حالیلانی‌یەو هیچ حالیلانی‌یەك ناهێڵێت منداڵی لەڤەیسی‌خانی ببێت و دوایی بتوانێت چەك هەڵگرێت!

بڕوانە.. بێریڤان دوژمنە، سیڤان، دوژمن..

حامۆ دەلەرزێت، سەر لەنوێ هەڵدەچێتەوە...

حامۆ: بۆ یەکێکت نەنا بەکەللەی سەریانەوە؟ بۆ مێشکیانت هەڵنەگرت؟ بۆ لمۆزیانت پڕ لەقوڕقوشم نەکرد؟

سیڤان: بابە ئێمە ناهەقی دەکەین!

حامۆ ناتوانێت باوەڕ بکات کەشتی وا دەبیستێت...

حامۆ: گوتت چی؟ گوتت گوایە ئێمە ناهەقی دەکەین؟ کێ ناهەقی دەکات، ئێمە؟

سیڤان: بەڵێ ئێمە! ئێمە رێککەوتنەکەمان تێکدایەوە. ئێمە بووین یەکەم جار مەرجەکانی رێککەوتنەکەمان ژێر پێ خست! ئێمە بووین چەکدارمان کردە سەر حالیلانی. ئێمە ئەبوزەڕی برامان لێ هاندان. ئێمە عەیبەمان هێنایە سەر خۆمان!

ئەم گوتانەی سیڤان، حامۆ شێتگیرتر دەکات، تووڕە دەبێت، لێوەکانی دەلەرزن...

سیڤان: حالیلانی تەنها پارێزگاری‌یان لەخۆیان کرد، گەر بیانویستبا دەیانتوانی ئەبوزەڕو ئەوانی دیکەش بکوژن، نەیانکرد، هەتا بۆ بەهۆش‌هێنانەوەشمان کردارێکیان نەنواند. ئەوان بیریان لەبێریڤانی خوشکیان دەکردەوە.. بەڵام تۆ، تۆ بەئاواتی دەخوازیت بێریڤان بمرێت! ئێمە رێککەوتنەکەمان تێکدا، بابە، ئێمە، ئێمە تاوانبارین!

حامۆ: هیچ وانی‌یە! حالیلانی بۆیە تەقەیان نەکرد چونکە لێمان ترسان. ئێمە رێککەوتنەکەمان تێکنەدا، ئەوان پەیمان شکێن بوون! ئایا بێریڤان منداڵی لەبارخۆی دەبات کچی ئەوان نی‌یە؟ بۆ منداڵی لێمان نابێت؟ بۆ؟ ئایا جوداوازی هەیە گەر منداڵێك بەکۆرپەیی لەکاتی لەدایکبووندا بکوژرێت یا پاشتر بەبیست ساڵی؟

سیڤان: کوڕە بابە کێ منداڵی خۆی بەئەنقەست دەکوژێت؟ ویژدانت بێت، بێریڤان نەخۆشە، خۆت چاك دەزانیت، نەخۆشە! نابینیت چۆن کەوتووینە ژێر باری ئازارەوە؟ دەروێش نەما، شێخ نەما نەچینە لای، نەمانتوانی چارەسەری بکەین.. بێریڤان نەخۆشە، پێویستی بەلاواندنەوەیە، بەدڵنەوایی‌یە، بەیارمەتی‌یە! بێ دەستەڵاتە، بێ هێزە...

حامۆ: بڕوانە، بابڵێین یەکەم کۆرپەی بەڕاستی بەنەخۆشی مرد... باشە ئەی دووهەم، ئەی سێهەم؟ هەموو بەنەخۆشی مردن؟ باوەڕ دەکەیت؟

سیڤان: بێریڤان نەخۆشە، تۆ مل نادەیت، بێریڤان نەخۆشە، زۆریش نەخۆشە، گەر چارەسەرێکی بۆ پەیدا نەکەین دەمرێت.

حامۆ: بابمرێت! براکانم کوژران، کوڕەکانم کوژران، ئامۆزاکانم کوژران، کێ دەزانێت چەندی دیکەمان لێ دەکوژرێت! بائەوانیش بمرن! بووکمان نییە دوژمنە لەنێوماندا! دەیبینیت، دەیبینیت، بەڵام ئەوکاتە زۆر درەنگە دەکات.

سیڤان: بێریڤان ژنمە، بابە... ئەندامێکی خێزانەکەمانە، شەرەفی خانەوادەکەمانە، ئەو حالیلانی نییە، ڤەیسیخانییە.

حامۆ: هیچ کات حالیلانی نابێتە ڤەیسی خانی. شتی وانابێت!

زۆر لەسیڤان دەچێتە پێش...

حامۆ: حالیلانی حالیلانییەو ڤەیسیخانی ڤەیسی خانی. ئەو منداڵەی لەو بکەوێتەوە قەت نابێتە ڤەیسی خانی. ئەو سێوەی بەردەبێتەوە، لەدارەکەی دوورناکەێتەوە... بێریڤان دوژمنە لەنێوماندا، کەسێکە دەستی ئێمەی لەپشتەوە بەستۆتەوە! ئەو هۆی ترسنۆکی تۆیە! پێشان وەکی هەڵۆ وابوویت، پیاو زاتی ئەوەی نەدەکرد سەیری نێوچەوانت بکات، بەڵام ئێستا بوویتە چەقەڵی گەڕ! لەپێناوی ئەودا شۆرەتو نێوی بەرزی ڤەیسیخانیت وا سووککردووە کەچیدی سێ فلس ناهێنێت، سێ فلس!

سیڤان تێدەگات ئەم چەلەحانێیە بێ سەرئەنجامە، هەوڵ دەدات لەوە زێتر جۆش نەسەندێت...

سیڤان: تۆ بابمیت، خوێنمیت، سەرم لەرێتدایە، دەستت رادەمووسم، پێت ماچ دەکەم.. هێندە لەگەڵم رەق مەبە، هێندەم پێدا هەڵمەشاخێ. ئەوە لەیادمەکە کەبێریڤان ژنی منە، کەمنداڵی لەبارچووە تاوانێکی نەبووە. کەس هەیە کۆرپەی خۆی بەدەستی خۆی بکوژێت؟

حامۆ: ئەو کوشتوونی، چونکە حالیلانییە، هێشتا داخ لەدڵە!

سیڤان: تۆ بابمیت، خوێنمیت، دەستو پێت رادەمووسم، رێگەمان بدە بارکەین بڕۆین، تا لەبەرچاوانت گوم بینو ئیدی دڵت ئاوبخواتەوە.

حامۆ: دەتەوێت بۆ کوێ بڕۆیت؟

سیڤان: گرنگ نییە، بۆ هەر شوێنێك بێت!

حامۆ: کەواتە کەگرنگ نییە بۆ هەر شوێنێك بێت، دەبڕۆ، بڕۆ، هەستە حالیلانی چاوەڕێتن، ئامێزیان بۆ کردوویەوە! بڕۆ بۆلایان، سەرت شۆڕکە. پێیان بڵێ دەترسم هاتووم بمبەخشن، بڕۆ بۆلایان...

حامۆ پەلاماری سیڤان دەدات، پاڵی پێوە دەنێت، تێی هەڵدەدات، دەنەڕێنێت.

حامۆ: هەستە، هەستە بڕۆ پێش ئەوەی خوێنی ڤەیسیخانییان ووشکبێتەوە. بڕۆ هێشتا خوێنی ڤەیسیخانییان هالاوی لێ هەڵدەستێت، سەری شەرمەزاریت بۆ بڵندیی حالیلانییان نەویکە! خۆت لەژێر کراسەکەی بێریڤاندا بشارەوە هەی نامەد، بێ ئابڕوو.

سیڤان: بابە ئەمانە گوتەی تۆ نین! تۆ گەورەی ئێمەیت، سەروەرمانیت، تۆ چ دەڵێیت؟

حامۆ: هەڵسە..

ئامبازی سیڤان دەبێت... سیڤان دەست ناکاتەوە... دەکەوێت، تەنها بەدەستەکانی سەروچاوی خۆی دەگرێت.. زۆر تووڕەیە، بەڵام دەنگی دەرنایەت. شۆڵاوگەی خوێنی لێوەکانی دەسڕێت... خەڵکەکەی دەورو بەری دەوارەکان دەڕواننە ئەم مەشهەدە...

بێریڤان بەپەژارەوە لەم مەشهەدە دەڕوانێت... سیڤان هەڵدەستێتو بێ تواناو بەلارەلارە بەرەو ئەو دەوارە دەڕوات کەبێریڤانی لەژێردایە... چەماوەتەوە... وەکو بەردێك بەسەر کۆڵییەوە بێتو نەتوانێت راستبێتەوە...

## 11– دەوارەکەی سیڤان

سیڤان دەچێتە ژوورەوە، سەری لەنێو لەپیدا دەشارێتەوە، بێ تواناو بێ دەستەڵاتانە دەچەمێتەوە... بێریڤان وەستاوە.. هەست بەتاوان دەکات، چونکە دەزانێت ماکی ئەم مەرگەساتە خۆیەتی... لەچاوەکانیدا پەژارەو سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر سیڤان دەبریسکێنەوە...

کاتێك سیڤان بێ هیواو دڵ پڕ لەئازار خۆی دەخواتەوە، لەدەرەوە دەنگی دەف دەبیسترێت... تادێت دەنگەکان نێزیکتر دەکەونەوە، چێتر دەبیسترێن، نیشانەی ئەو گێژاوە دەروونییەی سیڤانن لەگەڵ دەنگی دەفەکاندا گۆرانی دەبیسترێت..

((دەتوانرێت لەگەڵ ئەم لەقتەیەدا چەند لەقتەیەکی کەوی نێوقەفەزەکان نیشان درێت)).

## 12– دەوارەکان

دەروێشە دەفلێدەرەکان وەك پەڵەهەورێك بەنێو دەوارەکاندا رادەبوورن.. هێمای بەرسەچوونی کاتێکن... لەسیمای پیرو ژنو منداڵەکاندا جۆرەها خرۆشاندن بەدی دەکرێن... دەموچاوی دەفژەنەکان نیشان دەدرێن، هەریەکەیان نیشانەی جۆرە بارێکی دەروونین...

شەو خێوەتی خۆی بەسەر دەوارەکاندا هەڵداوە

((پێویستە لێرەدا وێنەی گونجاوی ئەم شوێن کاتە پیشان بدرێت)).

## 13– دەوارەکەی حامۆ

حامۆو هەر دوو ژنەکەی "یەکێکیان دایکی سیڤانە" سیلۆو ژنەکەی، ئەبوزەڕو ژنەکەیو منداڵەکانی لەدەوری سفرەی شێوان گردبوونەتەوە... حامۆ دیارە بیردەکاتەوە.. بەبێدەنگی نان دەخۆن. خواردنێکی هەژارانەو ساکارە... گشت خێزانەکە بەبێ ئارامی چاوەڕوانن بزانن حامۆ بیر لەچی دەکاتەوە... دەیەوێت چ بڵێت...

ژنە گەورەکەی حامۆ: سیڤان دەڕوات، رێگەی دەدەی؟

حامۆ: ئەگەر دەخوازێت بابڕوات، کێ رێی لێ گرتووە؟ من لام گرنگ نییە! وا دەنەڕێنێت کە ووردەنانێکی زۆر لەدەمی دەردەپەڕنو دادەبارێنە سەر سفرەکە. ژنەکەی لەپرسیارەکەی پەشیمان دەبێتەوە.. دایکی سیڤان لەسەر نان خواردن هەڵدەستێت...

حامۆ: بۆ هەڵدەستیت؟

دایکی سیڤان: تێرم خوارد.

حامۆ: دانیشە.

ژنەکەی دادەنیشێتەوە...

حامۆ: بڕوانە چۆن وەجاخێکت بۆ ڕوون کردووەمەوە! ئەوە کوڕ نییە، لەکەی عەیبو عارە... لەکەیە، لەکە!

ژنەکەی هیچ نالێت...

حامۆ: سیڤان دەڕوات چونکە خۆی بەیەکێك لەڤەیسیخانی نازانێت... یادەبێت سیڤان بڕوات، یان دەبێت بێریڤان بۆ ماڵە باوانی بنێرێتەوە...! هەردوو پێکەوە بۆیان نییە لای ئێمە بمێننەوە. ئارەزووی خۆیەتی، یا ئێمە، یا حالیلانییان... ئەوە پێوەندیی بەخۆیەوە هەیەو دەکەوێتە سەر بڕیاری خۆی!

### 14 – شەو؛ لەدەوارەکاندا

حامۆ پاڵ کەوتووەو دەڕوانێتە گۆشەیەك... هەردوو ژنەکەی لەپێخەفێکی دیدان، تاوێك دەنوونو تاوێك بێدارن.. پیاو هەست بەبێ ئارامییان دەکات... ئەبوزەڕو ژنەکەی لەپێخەفێکدان...

ئەبوزەڕ: سیڤان خیانەتی لێ کردین.

ژنەکەی: بێریڤان نەخۆشە!

ئەبوزەڕ: نەخۆشە؟ تۆش پشتگیری لەو دەکەیت؟

لەجێگەکەیدا خۆی قنج دەکاتەوە...

ژنەکەی: من تەنها گوتم نەخۆشە، شتێکی دیکەم گوت؟

ئەبوزەڕ: نەخۆش نییە...

لەپڕ بەربینی ژنەکەی دەگرێت...

ئەبوزەڕ جارێکی دی شتی وا بەسەر زارت گوزەر بکات، دەتخنکێنم! بێریڤان نەخۆش نییە، حالیلانییە...

ژنەکەی بەپەلەپڕوزێ خۆی قوتار دەکات... قوڕگی ئازاری دەدات.. دەکۆکێت.

سیلۆو ژنەکەی

سیلۆ پاڵ کەوتووە، ژنەکەی لەپشتییەوەیە، چاوی نووقاندووە.. بەخەبەرەو خەمناك دیارە.. بەهێواشی دەست بەگیانی سیلۆدا دەهێنێت، تا خرۆشی هەڵسێنێت.. سیلۆ دەستی دوور دەخاتەوە، دووبارە دەست دەهێنێتەوە.. پیاو هەست دەکات کەبە ئالۆشو لەسەر جۆشو خرۆشە... سیلۆ دووبارە دووری دەخاتەوە.. ژنەکەی بەچرپە دەپاڕێتەوە.. سیلۆ جارێکی دیکەش دووری دەخاتەوەو شەپێکی تێ دەسرەوێنێت...

منداڵەکان لەگۆشەیەکدا لاڵو پاڵکەوتوون... بێنازو بەدبەخت دەنوێنن.

شەوێکی نائارامە...

((مێگەلەکەو هەندەك ئاژەڵی دیکە لەدەوارێکدان))

### 15– شەو؛ لەبەردەم دەوارەکەی سیڤاندا

نەمامە گچکەڵە باریکەلەکە لەبەردەم دەوارەکەدا هەڵچووە...

((دەبێت نەمامو کەوەکان لەکۆتایی فیلمەکەدا لەیادی بینەر نەچن))

### 16– شەو؛ لەدەوارەکەدا

هەردوو کەوەکەی بێریڤان..

سیڤان سەری لەنێو لەپیدا ڕاگرتووە، بەبێدەنگی دەگری.. دیاردەی شێواویو بێ دەستەڵاتییە...

بێریڤان هەڵتووتاوەو سەری شۆڕکردۆتەوە، هەنسك هەڵدەدات، ناتوانێت بەر بەگریانی بگرێت.. ڕوو وەردەگێڕێت، دەیەوێت سیڤان ڕووی نەبینێت. سیڤان دەزانێت هەڵویستی بێریڤان چەندە دەردناکە، ئازاری خۆی لەبیردەچێتەوە، دڵنەوایی ئەو دەکات...

سیڤان: ویستم ڕێگەی نێچیرەڤانو ڕاڤنیو باران بدەم، بەلام نەمتوانی هیچ بڵێم.. گەر سیلۆمان لەگەڵ نەبایە ڕەنگە گوتبامو وەرن قسەی لەگەڵ بکەن، بەلام سیلۆ هەموو شتێکی بۆ بابم دەگێڕایەوە، ئیدی قۆرتی زێترمان تووش دەهات.. دیتت چ ڕووی دا، دیتت...؟

بێ هیوا چاوەڕوانی وەرامێتی، چاوەڕوانە، هەرچەندە دڵنیایە کەوەرام ناداتەوە!

سیڤان: بێریڤان، ئاسکۆڵەکەم، خۆت دەزانیت چەندەم خۆش دەوێیت، چەندەت ئازار لەگەڵ دەچێژم... یارمەتیم بدە، تکا دەکەم... بڕوانە چیمان بەسەرهات، چەندە بێ دەسەڵاتین... تیرەی ڤەیسیخانی یەکیان گرتووەو دژی ئێمە وەستاونەوە..! کۆتایی بەم بێ دەنگییەت بهێنە.. من لەخەمو پەژارەت دەگەم، بەلام گەر نەدوێیتو نەیەیتە گۆ، هەڵویستی من سەختتر دەبێت... لەگەڵم بدوێ، قسەم بۆ بکە، بڵێ چیتە... هیچ نەبێت خەمەکانت، ئازارەکانتم بۆ هەڵڕێژە. دەمەوێت بەشداریی ئازارەکانت، خەمەکانت بکەم.. تەنها یەك ووشە بڵێ، یەك تاکە دەنگ، ئیدی هیچم ناوێت...

بێریڤان سەر بادەداتو دڵۆپە فرمێسکەکانی هۆن هۆن بەسەر کوڵمەکانیدا دەڕژێنەخوارێ...

سیڤان: من باوەڕت پێ دەکەم، بێریڤان، من دەزانم تۆ بێتاوانیت... کەس هەیە کوڕەی لەبارخۆی بەرێت؟ ئایا باوەڕ دەکرێت؟ ئەوەی ئاوها بیربکاتەوە شێتە... بابم خەرەفاوە، دوژمنایەتی، هەستی دڵی، بەرچاوی تاریك کردووە..! بێریڤان، ئاسکۆڵەکەم.. باوەڕ بکە چاك دەبیەوە، نەخۆشییەکەت چارە دەکرێت، منداڵمان دەبێت، هێشتا گەنجین ... دەتوانین بەسەر ئازاردا زاڵ بین.. دەبێت ڤەیسیخانی شەرمەزاربن، چونکە ئازاریان داویت.. لەگەڵم بدوێ، بێریڤان، دەبڵێ ئاسکۆڵەکەم، گەر تەنها وشەیەکیش بێت.. ئەمجارە دەتبەمە لای پزیشکێك.. گرنگ نییە خەڵکی چ دەڵێن..! چ دەڵێن بابڵێن... لەشێخو دەروێش هیچمان نەبەستەوە، هەر هەمووی بەهیچ چوو. دەڕۆینە شار، دەچینە لای پزیشك، هەوڵی پەیداکردنی کارێکیش بۆ خۆم دەدەم... گشت لەوەڕگاکان کێڵران، ئاژەڵ ڕوو لەقڕانن... هەموو خەڵك بۆ شار کۆچیان کرد، تەنها ئێمە ماوینەوە... ناسیاوێکم بەڵێنی داومێ لەکۆمپانیای ڕێگەوبان کارێکم بۆ پەیدابکات، بەڵکە گەفتی خۆی بەرێتەسەر. پەیداکردنی کاری ئاوها، پووڵی دەوێت... هەرچۆنێك بێت هەڵیدەسووڕێنین. کلاشینکۆفەکە دەفرۆشین، بێگومان سی هەزار دەکات لەشار دەمانچەیەکمان بەسە.. هەموو ئەم دەردیسەریانە بەسەردەچن، بێریڤان.. لەش ساغ دەبین.. گەر لەڤەیسیخانی دوور کەوینەوە هەموو شتێك بەدڵی خۆمان دەبێت، ئەوان لەئێمەو ئێمەش لەدەست ئەوان ڕزگار دەبین. حەز لەچارەمان ناکەن... باهەر بڵێن، دەڵێن من لەڤەیسیخانی دابڕاووم، بابڵێن، من تەنها یەك شت دڵتەنگم دەکات، من باوەڕم بەتۆیە، بێریڤان، خۆشم دەوێیت، دڵم لاتە، لەگەڵم بدوێ، مەمرەنجێنە، قسەم بۆبکە، گەر تەنها وشەیەکیش بێت.



(دەخزێتە پاڵیو هەوڵ دەدات بەگوتەی ناسك بیدوێنێت...)

بێریڤان بەپەژارەو بێ دەنگییەوە تێی دەڕوانێت.. هەوڵ دەدات بێتە گۆ... دەمی دەکرێتەوەو دادەخرێت، سیڤان هیوایەك پەیدا دەکات، بەڵام بێریڤان نادوێت...

بێ هیوایی گەمارۆی سیڤان دەداتەوە.. هەست دەکات گوتەکانی بەهیچ چوون، بێدەنگییەکەی بێریڤان وردەوردە گرژی دەکات...

سیڤان: لەگەڵم بدوێ، هێندە کەللەڕەق مەبە... نا تکایە... نا تکایە... ئاسکۆڵەکەم، بێریڤان، دڵەکەم... ئازارەکانتم پێ بڵێ... یارمەتیم بدە، تکایە یارمەتیم بدە...!

دەڕوانێتە بێریڤان بەڵام بێریڤان دەڵێیت منداڵێکی کەللەڕەقەو هیچ ناڵێت! هەرچەندە جارە جارە وا پێدەچێت بیەوێت بدوێت...

لەپڕ سیڤان توانای خۆڕاگرتنی نامێنێتو پڕ بەگەرووی دەنەڕێنێت...

سیڤان لەگەڵم بدوێ، ساڵێکە یەك وشەت لەدەم دەرنەهاتووە، زمانت لەدەمدا نییە؟ قسە بکە، قسە! شتێك بگێڕەوە، بڵێ نەخۆشم، یاخود گەر حەز دەکەیت جوێنێکم پێ بدە! بقیژێنە... شتێك بڵێ...!

چەناگەی دەگرێت، دەمی دادەپچڕێنێت تاناچاری بکات شتێك بڵێت...

سیڤان: دەبڵێ... لمۆزت بدە بەیەکدا، بیکەرەوە، ناڵەیەك بکە... بڵێ ئاااااا، مڕەیەك بکە، تەنها دەنگێکت لێ بێت...!

تاسیڤان زێتر دەڵێتو دەقیژێنێت، تووڕەتریش دەبێت، دەنگی بڵندتر دەبێت. دەست بەلێدانی دەکات سەرەتا بەئەسپاییو دوایی توندتر...

سیڤان: گەر قسە ناکەیت بقیژێنە، بنەڕێنە، بگری، بکوڕوزێرەوە، بڵێ لێم مەدە، بڵێ بەسە، بپاڕێوە...!

لێی دەداتو لێی دەدات تا بقیژێنێت...

سیڤان: هاوارکە، بڵێ بەسە، بەسە، دەبڵێ...

لەگەڵ ئەو هەموو لێدانەشدا، بێریڤان نقەی لێ نایەت، وشەیەك ناڵێت...! سیڤان هەناسەی سوار دەبێت بێ هیوا

دەستبەرداری دەبێت، وازی لێ دێنێت.
لەپڕ حامۆ دەبینێت، بەحەپەساوی‌ی تێی دەڕوانێت.. حامۆ وەك شەبەحێك وەستاوەو زۆر لەسەرخۆ دەدوێت...

حامۆ: بێ هودە خۆت ماندوو دەكەیت.. قسە ناكات.. حالیلانی‌یەكی چەپەڵە، زڕە ڤەیسیخانی‌یەكی وەك تۆ حالیلانی‌یەكی پێ زەوت ناكرێت...! گەر



ڤەیسی‌خانی‌یەكی ڕەسەن بایتایە دەشیا، بەڵام سەری خۆت دێشێنیت...، نادوێت...!

سیڤان شێتگیر دەبێت، لەپڕ بەڕوویدا دەتەقێتەوە.. لەخۆی دەدات و دەڵێت:

سیڤان: نەخۆشە!.. تێناگەیت، نەخۆشە!.. بەو هەموو لێدانە دەنگێكی لێ نەهات، نەخۆشە!... تێناگەیت نەخۆشە.. نەخۆش.. نەخۆش...!

حامۆ: نەخۆش نی‌یە حالیلانی‌یە.. دوژمنە.. پیاو خۆی لەدوژمنی نەخۆش ناگەیەنێت، بەنەخۆشی‌ی دوژمن باوەڕ ناكات..!

حامۆ چۆن وەك شەبەحێك پەیدابوو، هەرواش بێ‌دەنگ دەڕوات...

سیڤان دڵپڕو پەشیمان دەمێنێتەوە، نازانێت چ بكات.. دەخزێتە پاڵ ژنەكەی، بەسۆزەوە لەئامێزی دەگرێت، وەك ساوایەك دەداتە كوڵی گریان... بێریڤانیش ئەشكی بێ دەنگی دەڕێژێت...

**17- شەو؛ لەدەرەوەی دەوارەكانەوە ئاوازە بەسۆزە خەمناكەكەی سیڤان لەدوور دەبیسترێت...**

**18- شەو؛ دەوارەكان**

دەم و چاوی حامۆ، ژنەكەی ئەبوزەڕ، سیلۆو ژنەكەی نیشان دەدرێن، ژنەكەی سیلۆ هەنسك هەڵدەدات، چاوەكانی نمناكن.. ئاوازە خەمناكە دڵگیرەكەی سیڤان كاری لەهەمووان كردووە...

**19- مێگەلەكە**

بەپێچەوانەی لەقتە هەڵچووەكانی پێشان، ئێستا وێنەی یەك لەدووی یەكی وا نیشان دەدرێن كەئارامی و هێوری بەدەردەخەن، ئەبوزەڕو سیلۆ لەدیار مێگەلەكەن. وێنەیەك پێشان دەدرێت كەئارام بەخش‌بێت، وەك چۆن مرۆ تۆزی ماندوێتی لەگیانی خۆی دەتەكێنێت.. لەدوورەوە ئاوازی شمشاڵەكەی ئەبوزەڕو گۆرانی‌ی چەرچی‌یەكە دەبیتسرێن...

سیلۆ قوت بۆتەوەو دەڕوانێتە چەرچی‌یەكە كەخەریكە بەرەو ڕووی ئەمان دێت. ئەبوزەڕ شمشاڵی خۆی دەژەنێت. چەرچی‌یەكە بەخۆیی و دوو هێسترە زەنگوڵە لەملەكانی‌یەوە دەردەكەوێت.

سیلۆ دوو قاپولکەی کۆنەی تۆزاویی لەخورجەکەی دەردەهێنێت، بەنووسین و وێنەی وا نەخشێنراون کەلەیەکەم سەرنجدا هەستی پێناکرێن.. ئەمانە دوو دانەن لەو سەدان قاپولکەیەی کەمێژووی دێرینی پاشانشینێکیان لەسەر هەڵکەندراوە...

(پاشان لەرۆژنامەیەکدا، وێنەی ئەم قاپولکانە لەلەقتەیەکی نێزیکدا نیشان دەدرێت)

سیلۆ: تۆ بڵێیت کەمێك کشمیشمان لەبریتی ئەمانە بداتێ؟

ئەبوزەڕ: گەر لەمن دەپرسیت، پێم وایە گەزێك لاستیکت ناداتێ تا لەدەرپێکەتی هەڵکێشیت..! ئەمانە لەتەختە بەرد زێتر چیدی نین..

ئەبوزەڕ بەوردی دەڕوانێتە قاپولکەکان و هیچ سەریان لێ دەرناکات...

ئەبوزەڕ: ئەمانەت لەکوێ پەیداکردووە؟

سیلۆ: پێش چەند رۆژێك، ئەوکاتەی بۆ شەکەڕش دەگەڕام، لەئەشکەفتێکدا دۆزیمنەوە..

ئەبوزەڕ: کام ئەشکەفت؟

سیلۆ لەپێشەوە خەریکە راستی بڵێت، پاشان شتێکی دی دەڵێت...

سیلۆ: ئالەو لایە لەژێر گابەردێکدا...

مرۆ هەست دەکات کەهەوڵ دەدات ڕازێك نەدرکێنێت...

لەم دەمەدا چەرچییەکە نێزیکتر کەوتۆتەوەو بانگیان دەکات..

((لێرەدا گفتوگۆی نێوانیان نیشان دەدرێت، چەرچییەکە بەکورتی دەنگ و باسی هەموو دەوروبەرو مەڵبەندەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە. لەگشت نێوچەکاندا چەرچییەکان دەوری پەیامنێرو هەواڵهێنەر دەبینن)).

*[5]چەرچی: هێی سیلۆ، نەتبیست کە "چیندی"یان کوشت؟

سیلۆ: چیندی کێیە؟

چەرچی: کوڕەکەی "دورمازئاغا"..! بۆ لەوەڕگەکانی داوای پووڵێکی زۆری لە "دورەیخان"ە کۆچەرەکان کردبوو، ئەوانیش لەشیان سمی..!

((پاش ئەم وتووێژە، سیلۆ قاپولکەکانی پیشان دەدات))*

سیلۆ: ئەمانەت ناوێت؟

چەرچی: کوڕم ئەمانە چین؟

سیلۆ: نابینیت خەت و وێنەیان لەسەر کێشراوە...!

چەرچییەکە بەگومانەوە لەقاپولکەکان دەڕوانێت.

چەرچی: کوڕەکەم ئەمانە تەختەی بەردی ئاسایین. دەیسا لەبەرخاتری تۆ دوو کیلۆ لوقمەت دەدەمێ...

سیلۆ: دوو کیلۆ لوقم؟؟

ئەبوزەڕ: دەبێت کیلۆیەکیان کشمیش بێت.

چەرچی: نا، چاکە، مادام وات پێ خۆشە.. بەڵام ئەوەش تەنها لەبەرخاتری تۆ...

قاپولکەکان وەردەگرێت، کشمیش و لوقمەیان بۆ دەکێشێت و دەڕوات...

چەرچی: هەر بژین و نۆشی گیانتان بێت...

سیلۆو ئەبوزەڕ کشمیش و لوقم دەخۆن...

سیلۆ: ئۆف ئۆف، گەر پیاو لەشار کاری کردبا، دەیتوانی هەموو رۆژ کشمیش و لوقم بخوات.

ئەبوزەڕ: کابرا تۆ هەمیشە بیر لەشار دەکەیەوە...!

## 20- دەوارەکان

لەلەقتەیەکدا، کەسانێك نیشان دەدرێن کەبەکاری رۆژانەوە خەریکن.. مزگەرێك هاتووەو خەریکی مەنجەڵ سپیکردنەوەیەو نیشانەیان لەسەر هەڵدەکەنێت... مەنجەڵی زۆر ریزکراون.. لەولاوە بەرە دەچنرێت... هەندەك ژن تەشی دەڕێسن..

بێریڤان خەریکی ئەنجامدانی کارێکی گرانە.. سیڤانیش سەرگەرمی کارێکە.. سەرلەنوێ چریکەی گۆرانیی چەرچییەکە دێتەوە گوێ.. بێریڤان لەودەمەدا نەمامەکە ئاو دەدێرێ و گوێ رادەهێڵێت.. سیڤان پەشێوی ئەم چەند رۆژە بەروخسارییەوە دیارە.. کەچەرچییەکە دەبینێت، خۆی قیت دەکاتەوە، چاوەڕوانی هەواڵکی شادیهێنەری لێ دەکات...

حامۆ بەدەم و چاوە گرژو مۆن و تورەکەیەوە بەدیار مزگەرەکەوە وەستاوە، وەك بیەوێت چاوەدێری کارەکەی بکات..

کاتێك چەرچییەکە نێزیك دەکەوێتەوە، منداڵان رادەکەن و پێکدادێن، هەریەکە شتێکیان بەدەستەوەیەو گەرەکیانە لەگەڵ چەرچییەکە ئاڵو وێڵی پێ بکەن..

((لەبریتی پووڵ ،بەهێلکە، کەرە، پەنیر، خوریو پێستە، ئاڵو وێڵ دەکەن))[2]

چەرچییەکە لەلایەك خەریکی ئاڵو وێڵی خۆیەتی و لەلایەکی دی بەتیلەی چاو چاوەدێری حامۆ دەکات..

پاکەتە جگەرەیەکی جوان لەپێشی حامۆدا رادەگرێت.. حامۆ بەدڕدۆنگی تێی دەڕوانێت..

چەرچی: فەرموو ئەم دیارییە بگرە..!

حامۆ: لەپای چی؟

چەرچی: لەپای چی یانی چی؟ تۆ گەلەگ جار یارمەتیت داوم و هەمیشە لام ئازیز بوویت... هەموو کات کۆمەکمان بەیەکدی نەکردووە؟

حامۆ هێشتا بەدگومان ...

حامۆ: لایبە، تۆ هێندە شەریف نیت، پێم وایە شتێکت لەژێر سەردایە..!

چەرچی: چم لەژێر سەردایە؟

حامۆ: تۆ بێ مەرام هیچ بەکەس نایەیت... دیارە دەتەوێت شتێك بدرکێنیت.. دە بیڵێ و رزگارت بێت..!

چەرچی: راسپێردراو تەنها راگەیاندنی راسپاردەی لەسەرە..!

حامۆ بەجۆرێك تێی دەڕوانێت کابرا گوتەکانی قووت دەداتەوە.. پاکەتەکەی هەربەدەستەوەیەو وەستاوە...

حامۆ: راسپێردراوی کێی؟

چەرچی: گوتم پەیامهێنەر تەنها گەیاندنی لەسەرە.. نێچیرەڤانی حالیلانی پێی گوتم..

حامۆ: نێچیرەڤانی حالیلانی چی گوت؟

چەرچییەکە چەند جارێك گەرووی پاك دەکاتەوە، دەڕوانێتە دەوروبەری خۆی، سیڤان دەبینێت لەدوورێکەوە هەڵتروشکاوە، وەکو بەبینینی ئەو ورەی بەبەردا بێتەوە، هەوڵ دەدات بێتەوە قسەو سیڤانیش تێی بگات..

چەرچی: وەك گوتم من راسپێردراوم، پێیان گوتم عەرزی حامۆ ئاغا بکەم کەئەوان رێزیان بۆتان هەیە، بابی خوشکەکەیانیت، دەخوازن ئیدی دوژمنایەتی کۆتایی پێ بێت.

خوشکەکەیان نەخۆشەو ڕێگە بدە چارەسەرێکی بۆ پەیدا بکەن.

حامۆ: بۆ ئەمە هاتوویتە کنم؟

چەرچی: خۆت دەزانیت کاری من گەڕانە، بێ ئەوەش نەبوایە هەردەهاتم، وەکی هاتووم راسپێردێکیان پێ داوم، عەرزم کردن من تەنها گەیاندنم لەسەرە.

حامۆ: ئەم جۆرە پەیامانەم ناوێت، گەر جارێکی دی شتی ئاوهات پێ بوو پێ نەنێیتە خاکمەوە، نەیەیتە نێزیکم.. دەنا هەرچی روویدا لەئەستۆی خۆتە. من ڕێگەنادەم دوژمنم بەخاکمدا گوزەر بکات.

چەرچی: من تەنها ویستم...

حامۆ: چت ویست؟

وا دەنەڕێنێت کەچیدی چەرچییەکە ناتوانێت دەم هەڵهێنێتەوە.. بەپاکەتی دەستییەوە لەشوێنی خۆی وشکدەبێت...

حامۆ بەتوڕەییەوە بەجێی دەهێڵێت..

چەرچییەکە هێسترەکانی بەدووی خۆیدا بەکێش دەکاتو بەرەو رووی سیڤان مل دەنێت...

چەرچی: بابتمان ئاڵۆزاند.. خراپ لێمان تووڕە بوو.. خواستمان چاکەیەك بکەین.. کەللەشەقی چ سوودێکی نییە...!

سیڤان بێ دەنگ گوێ رادەهێڵێت...

سیڤان: ئاخ، گوێ مەدەرێ... هەرچی بێت بابمانە.. بۆمان نییە بەخراپە نێوی بەرین...

هێور دەبێتەوە...

سیڤان: پزیشکێك ناناسیت؟

چەرچی: پزیشك؟

سیڤان: رۆژی هەینی دێمەشار. بێگومان ناسیاوت هەن... گەرەکمە بێریڤان ببەمە لای پزیشك. جگە لەوە چاو دەگێڕم بەڵکە خۆشم کارێکم وەگیرکەوێت.. گەرەکمە کارێك بۆخۆم پەیداکەم.

چەرچی : کار؟

سیڤان: گەر کارێکی چاکم دەستکەوێت لێرە بار دەکەم، ئاژەڵ روو لەقڕانن، لەوەڕگە روو لەکزیو گرانین.. بڕوانە دونیایان کێڵا...

قامك بۆ دوور رادەکێشێتو تراکتۆرێکی نیشان دەدات..

((نابێت ئەم جۆرە لەقتانەی زەوی کێڵان بەردەوامو بێ کامێرا گواستنەوە نیشان بدرێن، دەبێت تەنها لەپشتیەوە نیشان درێن)).

چەرچییەکە دەڕوانێتو بینینی تراکتۆرەکە ئەمیش سەغڵەت دەکات..

چەرچی: راستە، گشت لەوەڕگەکان داچێنران، مەکینە گشت لایەکی هەڵدڕی، بەهەموو لایەکدا دەسووڕێنەوەو بازاڕی ئێمەشیان شکاندووە...! ئێستا پاسکیلو مەکینەو عارەبانە گەیشتوونەتە گشت کونجێك، راست دەکەیت، کاکە سیڤان تۆ پیاوێکی ژیریت، قسەت راستە، هەموو شت لەگۆڕاندایە، هەتا دوژمنایەتیش باوی نامێنێت، وانییە؟

سیڤان هەوڵ دەدات بزانێت مەبەستی چییە...

چەرچی: لەگەڵ نێچیرەڤان دوام، بەینی خۆمان بێت ئەویش حەزی بەشەڕو هەڵلا نییە، هێندەی من ئاگاداربم تۆش حەزی پێ ناکەیت..! وەرە دەست بدەنە دەستی یەکدیو کۆتایی بەدوژمنایەتی بهێنن. بێریڤان هەرچەندە کیژە حالیلانییە، بووکی ڤەیسیخانیشە، نەخۆشە، گەر خودا نەکردە شتێکی لێ بێت، خەمەکەی بۆ گشت لایەکمانە.. وەرە بەگوێم بکەو باکۆتایی بەهەموو شت بهێنین.

سیڤان: من هیچ دەستەڵاتم نییە...!

چەرچی: گەر تۆ ئارەزوو بکەیت، ئەوانی دی بەتەنها هیچیان پێ ناکرێت...!

سیڤان: منیش بێ توانام، هیچم پێ ناکرێت... کەس بەگوێم ناکات خۆ پیاو ناتوانێت هیچ بڵێت، بابم نەخۆشە... نەخۆشی راستەقینە ئەوە (سیڤان مەبەستی لەمێشکێتی).

سیڤان: کای لەمێشکدایە. نابینیت هەموو شت رابورد، بەسەرچوو، پێی وایە ڤەیسیخانی ئەوڕۆ ئەوانەی پێشینن، هێشتا زۆرو بەهێزن..! بەڵام لەراستیدا فەوتاین.. هەست ناکات.. تواینەوە...

چەرچی: ئەمانە بەنێچیرەڤان رابگەیەنم؟

سیڤان بیری لێ دەکاتەوە...

سیڤان: نەخێر

چەرچی: باشە مادام حەز ناکەیت..!

سیڤان: رۆژی هەینی چاوەڕوانمان بکە... بمانبەرە کن پزیشکێك... پێشەکی بەدوکتۆر رابگەیەنە کەبێریڤان نەخۆشە.. پێی بڵێ...

چەرچی: کەواتە تارۆژی هەینی..

سیڤان: تاهەینی...

## 21- **شار**

باری شارەکە بەلەقتەی گەورەو نێزیك نیشان دەدرێت.. نێچیرەڤانو راڤنیو باران بەسواریی لەسەرخۆ بەشەقامەکانیدا رادەبوورن. ئەمە ئاڵۆزییەك لەشاردا دەخولقێنێت. بەگوتە نا، تەنها بەهەڵسوکەوتی خەڵکیدا دیارە بۆنی ئاشووبی لێ دێت، چونکە خانەوادەی دوژمن بەیەك لەهەمان رۆژدا دێنە نێو شار. کپییەکی وەکو کپیی پێش گەردەلوول باڵ بەسەر شاردا دەکێشێت. ژەندرمە خەڵکی دەپشکنن.

چەرچییەکە لەبەردەم عەیادەی دکتۆردا چاوەڕانە. سیڤان وڵاخەکەی لەبەردەم میوانخانەیەکدا رادەگرێت، بێریڤان لەپشتەوە سواربووە، ئەبوزەڕ لەدوایانەوە رێدەکات. لەپێشەوە سیڤان بێریڤان دادەگرێت، ئەوجا خۆشی دادەبەزێت. سیڤانو بێریڤان لەپێشەوەو ئەبوزەڕ بەدوویاندا بەرەو ئەو شەقامە ملدەنێن کەعەیادەی دکتۆری لێیە.

باسری: ڤەیسیخانی خانەوادەیەکی کۆچەری هەژارن، بەهۆی دوژمنایەتییانەوە لەگەڵ حالیلانیدا لەخوێندا شەلاڵبوون. تەنها بابو سێ کوڕیان ماونەوە، حامۆی ڤەیسیخانی، پێم وایە تەمەنی حەفتاساڵێك دەبێت، کابرایەکی کەللەشەقە، بەکەللەڕەقی ناسراوە، سێ کوڕی ماون سیڤانو ئەبوزەڕو سیلۆ. مزگێن کوڕەگەورەی بوو، سەرەتای حەفتاو چوار، کاتێك قاوی لێخۆشبوونی گشتی داکەوت، لەگرتووخانەی (سیمرت)دا بەچەقۆ کوژرا، دەنگوایە گوایە بەفیتی حالیلانییان کوژرابێت. حامۆ ژنەکەی مزگێنی لەسیلۆ مارەکردەوە، ئەو دەمە سیلۆ تەمەنی سیازدەساڵان بوو. ویستی ژنەکە سەرگەردان نەبێت. ژنەکە تەمەنی چل ساڵێك دەبێت. ئافرەتێکە کوێرەوەری زۆری دیتوە. پیاو دەتوانێت بڵێت نموونەی ئافرەتی هەناسەساردی کوردە.



هەشت ساڵی ڕەبەق چاوەڕوانی مێردە بەندکراوەکەیی کرد، پاش ئەوەی مێردەکەی کوژرا، حامۆ کوڕەکەیی هاندا براگەورەکەی نێچیرەڤان بکوژێت، ئەویش سەری تێدا چوو، بەو هۆیەوە ئێستا برا گچکەکەی نێچیرەڤان لەگرتووخانەدایە. ئەمانە ئێمەیان هاندا بەدووی چارەسەرێکدا بگەڕێین. هەوڵماندا بکەوینە بەینەوە. قۆمیسەری ئەوکاتەش خۆتان ئاسایی پیاوێکی هێجگار چاك بوو. ئەویش کەوتە نێوانەوە. شێخ‌و پیرو ردێن‌سپی هەوڵی دۆزینەوەی چارەیەکیان‌دا. بەهەمووان هەوڵمان‌دا ڤەیسی‌خانی‌و حالیلانی ڕێکخەینەوە. ئەو سەروەختە سیڤان هێشتا لەگرتووخانەدا بوو. سیڤان کابرایەکی سەرڕاست‌و جوامێرە، حالیلانی حسێبی زۆر بۆ ئەو دەکەن. بەهۆی لێ‌خۆش‌بوونەوە لەگرتووخانە ئازادکرا. حامۆو سیڤانمان ڕازی‌کرد مەرجەکانی ڕێککەوتنیان دیاری‌کرد. حالیلانی بەمەرجەکانی ڤەیسی‌خانی ڕازی‌بوون. سیڤان تەنها ئاواتێکی هەبوو، ئەویش خواستنی بێریڤانی کچی حالیلانی‌یان بوو، ئەودەمە بێریڤان چواردەساڵان بوو، گوایە سیڤان لەیەکەم چاوپێکەوتنەوە شەیدای بێریڤان بووە، نەخێر، لەگەڵ دڵدا هیچ ناکرێت...! حالیلانی ملیان بۆ ئەو مەرجەی ڤەیسی‌خانی‌دا، بەو هیوایەی ئاشت ببنەوە. بێریڤانیان دا بەڤەیسی‌خانی. بەڵام چارەنووسی ڕێککەوتنەکە تاسەر نەبوو، بێریڤان یەکەم منداڵی لەبارچوو، حامۆ پێ‌ی وابوو منداڵەکەی بەئەنقەست کوشتووە، بەڵام ئەو دەمە مەسەلەکە هێندە گرنگ نەبوو، دوای مردنی دووهەم منداڵ، ئیدی حامۆ بڕوای بەڕیککەوتن نەماو لەبەهانە دەگەڕا، پاش مردنی هەرمنداڵێك گیانی دوژمنایەتی لەنێوانیاندا زێتر دەبووژایەوە.

مردنی سێهەم منداڵ بەدوو کاژێر پاش لەدایك‌بوونی، مەسەلەکەی هێجگار ئاڵۆزکرد، بەلای حامۆی ڤەیسی‌خانی‌یەوە، مردنی ئەو کۆرپانە پیلان بوو. سووربوو لەسەر ئەوەی کەبێریڤان خۆی منداڵەکانی تاساندووە، چونکە لەوەچەی دوژمنە.

جەنابی قۆمیسەر، ئائەم هۆیانە کڵپەی دوژمنایەتی‌یان هەڵایسانەوە، نەخۆشی

بێریڤان و مردنی ساواکان بەس بوون بۆ سەرهەڵدانەوەی دوژمنایەتی، راستی ئەمانە بیانوو بوون، حامۆ دەیخواست سەرئێشە بۆ حالیلانی یان بسازێنێت.

((پێویستە لەکاتی ئەم دیالۆگەدا چۆنیەتی رێککەوتنەکە نیشان بدرێت)).

## 22- بارەگای ژەندرمە

نێچیرەڤان و باران و راڤنێ و باسری (پارێزەرو رۆژنامەنووس) باسی کێشەی نێوان حالیلانی و ڤەیسی خانی بۆ قۆمیسەر دەگێڕنەوە..

باسری: هەرچەندە لایان روون بوو کەلەڤەیسی خانی خراپە دەوەشێتەوە بەڵام دانیان بەخۆدا گرت. هەتا بەرپەرچیشیان نەدانەوە. حامۆ پیاوێکی کەللەشەقە، چەکداری لێ هاندان، ئەبوزەڕی کوڕی ناردنەسەر، ئەبوزەڕ بەستەزمانێکی پەرکەمگرتووە، بەڵێ ئاوها بوو، حامۆ هەمووی تێکدایەوە، جا تکا لەبەڕێزتان دەکەین بەڵکە هەوڵ بدەن سەرلەنوێ ڕێکیان بخەنەوە، گەر جەنابتان حامۆی ڤەیسی خانی بانگ بکەن و قسەی لەگەڵ بکەن، یاخود سیڤان ئەورۆ دێتە شار، گەر جەنابتان لەگەڵی بدوێن، رەنگە چارەیەك پەیدابکرێت.

قۆمیسەر بەوریاییەوە گوێی راهێشتووە، بیردەکاتەوە، بزانێت چ بکات چاکە.

((دەتوانرێت لەکاتی ئەم دیالۆگانەدا وێنەی جیاجیای شارەکە نیشانبدرێت، بەڵام دەبێت ئەم چیرۆکە کورتە بەفلاشباك بگێردرێتەوە، دەشتوانرێت سەرتاسەر تەنها بیرۆی قۆمیسەر نیشان بدرێت. دەبێت پێش وێنەگرتن بریار لەسەر یەکێك لەمانە بدرێت، گەر فلاش باك پەسەند کرا، دەتوانرێت وێنەی وەستاو، پاشان جوڵاو، هەمدیسان وەستاو بەکار بهێنرێت))

## 23- شەقامەکانی شار

سیڤان لەپێشەوەو لەپشتییەوە بێریڤان و ئەبوزەڕ شەقامەکە دەبڕن، سیڤان حالیلانی یان دەبینێت بەرامبەر عەیادەی دوکتۆر راوەستاون.

حالیلانی یان بەنیمچە خۆحەشاردانێکەوە لەبەردەم دوکانێکی بەرامبەر عەیادەکەدا وەستاون.

بێریڤانیش بەدی یان دەکات.

سیڤان هەڵوێستەیەك دەکات و دەڕوات.

ئەبوزەڕ کەلەدوای ئەوەوە ڕێدەکات، هێشتا نەیدیتوون..

بێریڤان ناڕوانێتە براکانی، سەری شۆڕدەکاتەوەو دوای مێردەکەی دەکەوێت. لەبەردەرگەی عەیادەی دوکتۆردا سیڤان بەچەرچییەکە دەگات، وەردەچەرخێ و دەڕوانێتە حالالانی یان، ئەوانیش تێ ی دەڕوانن، بەڵام بەچاوی دوژمنایەتییەوە نا.

ئەبوزەڕ دەیانبینێت، دەشێوێت..

سیڤان شانی دەگرێت

سیڤان: وازیان لێ بهێنە گەوجێتی مەنوێنە، نە، هیچ ناکەن.

ئەبوزەڕ: تەقەمان لێ دەکەن!

سیڤان: شتی وا ناکەن. ناتوانن... واز بهێنە...

چەرچی: قسەم لەگەڵ دوکتۆر کرد!

سیڤان: سوپاس

چەرچی دەخوازیت بەنێچیرەڤان... شتێك...

سیڤان: لەم کاتەدا هیچمان نییە بیڵێین.

ئەبوزەڕ لەحاڵێکدایە کەناتوانێت بەسەر پەشێوی خۆیدا زاڵ بێت...

سیڤان: نا، گەوج مەبە.

روودەکاتەوە چەرچییەکە

سیڤان: ئاگات لێ ی بێت.

خۆی و بێریڤان دەچنە ژوورەوە...




## 24- عەیادەی دوکتۆر

چەند جوتیارێکی چاوەڕوانکەر... مێش و مەگەز... هەندەك ژن و منداڵ.. مێشوولە... بۆگەن... دەمو چاوی لاوازو دەردەدار...

سیڤان و بێریڤان لەگۆشەیەکدا هەڵدەتروشکێن، دەڕواننە وێنەکانی سەر دیوارەکە، پڕوپاگەندەی دەرمان و دژەنەخۆشی.. پۆستەگەری رەنگاوڕەنگ بۆ راکێشانی گەرپێدە...

پاش ئەوەی نەخۆشێك دێتە دەرەوە، سستەرەکە یەکێکی دی دەکاتە ژوورەوە. نەخۆشەکان کەسانێکن کەدوا پەنایان بۆ بەر دوکتۆر هێناوە، خەریکن لاردەبنەوە.

((دەبێت کەسەکان زۆر بەوریایی هەڵبژێردرێن)).

نەخۆشێکی دی دەبەنە ژوورەوە... پیاو هەست دەکات ئەو یەکەی هاتە دەرەوە دەرزی لێدراوە... دەبێت باری ناساغی یان لەیەکەم سەرنجەوە هەست پێ بکرێت...

سیڤان لەپەنجەرەکەوە چاوەدێری حالیلانی یان دەکات..

چەند لەقتەیەکی نێو شارەکە کەباری شارەکە نیشان بدەن...

ئیدی نۆرەی سیڤان و بێریڤان دێت، سستەرەکە بانگیان دەکات، دەچنە ژوورەوە...

دوکتۆر: چیتانە؟

سیڤان: ژنەکەم ناساغە.

دوکتۆر دەڕوانێتە بێریڤان، بێریڤان لەبەردەمیدا وەستاوەو ملی بەلارەوە گرتووە...

دوکتۆر: خوشکێ چیتە؟

بێریڤان وەرام ناداتەوە...

سیڤان: یەکەم منداڵمان مرد، دووهەم بەحەوتمانگی لەبار چوو، سێهەمیش مرد، جەنابی دوکتۆر، تەنها دوو کاژێر پاش لەدایکبوونی!

دوکتۆر: خوشکم تەمەنت چەندە؟

سیڤان: هەژدە

دوکتۆر بیرێکی لێدەکاتەوە. تەختەیەکی نیشان دەدات...

دوکتۆر: ئالێرەدا پاڵ کەوە

بێریڤان نابزوێت.. دوکتۆر ئامێری پشکنینەکەی هەڵدەگرێت، ئەو کاتەی

خۆی بۆ فەحسی ئامادە دەکات، هەست بەبایەخپێ نەدانی بێریڤان دەکات

دوکتۆر: چیتە خوشکم؟ پێم بڵێ کوێت ئازارت دەدات، پاڵ کەوە تابتوانم فەحست بکەم، مەترسە!

بێریڤان متەق ناکات و تێ ی دەڕوانێت...

سیڤان: لەدوای مردنی دواهەمین منداڵمانەوە، ئیدی بێریڤان زمانی کلیلەدراوە، گەورەم، چیدی نەمانتوانیوە بیهێنینە قسە! هەر دەڵێیت زمانی لەدەمدا نەماوە!

دوکتۆر: چۆن... بەهیچ جۆرێک نادوێت؟

سیڤان: نەخێر.. یەك تاقە وشە چی‌یە.. یەك ساڵ زێترە، نازانین بۆ! رەنگە لەخەفەتدا بێت.. تاقە جارێك لەگەڵ منیش نادوێت... پێشان لەگەڵ کەوەکان دەدوا، خۆشی دەویستن، ئێستا چیدی لەگەڵ ئەوانیش نادوێت..!

دوکتۆر سەرەتا هیچ سەری لێ دەرناکات، ماوەیەك بیری لێ دەکاتەوە، سەر لەسیڤان دەباتە پێش شتێکی بەگوێدا دەچرپێنێت، سیڤان ملی نەوی دەکات و گوێ رادەهێڵێت، دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕێت...

سیڤان: خودا شاهیدە شتی وانەبووە.. ساڵێك زێترە.. نەبووە.. بەهیچ جۆرێك نەبووە.. ساڵێك زێترە.. شێخ و دەروێش نەما دەرگای رانەتەکێنین.

دوکتۆر هەوڵ دەدات بێریڤان فەحس بکات، ناهێڵێت. رێگە نادات دەستی تێوەدات، دوکتۆر تێ دەگات، بزەی دێتێ.

دوکتۆر: وەرە خوشکەلێ لێم مەترسە، من پزیشکم! پێویست بەشەرم ناکات، دوکتۆر بەگشت کەس مەحرەمە، من لەتەمەنی بابتدام، کچەکەم لەتەمەنی تۆدایە، قوتابی زانستگەیە، چۆن دەتوانم دەردەکەت بدۆزمەوە گەر رێگەم نەدەیت فەحست بکەم، پێم بڵێ چۆن؟؟؟

بێریڤان هیچ وەرام ناداتەوە...

دوکتۆر پەلی سیڤان دەگرێت و لەژوورەکە دەیباتە دەرەوە، بێریڤان بەتەنها دەمێنێتەوە، بەسەرسوڕمانەوە دەڕوانێتە دیوارەکان، وێنەکان، ئامێرەکان، پاش ماوەیەك سیڤان دێتە ژوورێ.. بێ‌دەنگەو بیردەکاتەوە چۆن چۆنی رازی‌ی بکات، خۆی لێ دەباتە پێشەوە...

سیڤان: بێریڤان، ئاسکۆڵەکەم.. رێگە بدە دوکتۆر فەحست بکات... چ دەبێت؟ بۆ رێگە نادەیت یارمەتیمان بدات؟ با کۆتایی بەبەدبەختی بهێنین، ئەو پزیشکە مرۆ شەرم لەپزیشك ناکات... کاتێك چوومە سەربازی، پزیشکەکان فەرمانیان‌دا دەرپێکانمان داکەنین... روانیانە گشت جێ‌یەکمان، هەتا کۆمیشمان...!

بێریڤان شان هەڵدەتەکێنێت، یانی رێگە نادات... سیڤان لێ‌ی دەچێتە پێش، لای دوکتۆر تووشی هەڵوێستێکی دژوار هاتووە...

سیڤان: ئەو پزیشکە، بێریڤان.. مرۆ شەرم لەپزیشك ناکات... دەبێت فەحست کات... پزیشك فەحسی هەموو کەس دەکات.. گەر فەحست نەکات ناتوانێت دەردەکەت بدۆزێتەوە...!

بێریڤان متەق ناکات، سیڤانیش هیچی لەدەست نایەت...

سیڤان: گەر رێگەی نەدەیت ئیدی چۆن دەتوانین چارەی چەرمەسەری‌یەکانمان بکەین؟ ئازیزەکەم بێریڤان، ئاسکۆڵەکەم... رێگەی بدە کەللە رەق مەبە...!

بێریڤان هێشتا هەر رێگە نادات، ئەوجا سیڤان دەزانێت دەبێت چ بکات...

سیڤان: بۆ رێگە نادەیت فەحست بکات؟ باشە هیچ نەبێت بڵێ ئێرەم ئێشێ یا ئەوێم دێشێت، دەبڵێ.

هەر وەرام ناداتەوە، سیڤان ئارامی لەبەر هەڵدەگیرێت و سەربادەدات...

سیڤان: ئۆ خودای مەزن ئارامم پێ ببەخشە، خودایە ئارام.

ئەوجا بەتوڕەیی‌یەوە لەبێریڤان دەڕوانێت..

سیڤان: ساکەواتە بۆ هاتینە ئێرە بێریڤان؟ ئەو رێگە دوورەمان بۆ بڕی؟ کەئەمە رەفتارتە بۆ پێشەکی نەتگوت؟ دەردی‌سەریم بۆ مەخوڵقێنە کەللە رەق مەبە.. یاخود شتێکی دیکەت لەخەیاڵدایە؟ دەبڵێ.. براکانت لەدەرەوە چاوەڕوانتن، دەتەوێت بڕۆیتەوە لایان، دەتەوێت من سەرگەردان بکەیت و بچیتەوە کن ئەوان؟ گەر ئەوەت لەخەیاڵدایە، ئەوەتان دەبڕۆ...

بۆلای دەرگەکە پەلکێشی دەکات.. لەوکاتەدا دوکتۆر دێتەژوورەوە.. رووداوەکە لەسەرێکەوە خەندەدارەو لەسەرێکی دی‌یەوە دڵتەزێنە.. خەندەیەکی تاڵ لەرووی دوکتۆر دەنیشێت..

سیڤان: گەورەم، دەستەکانت ڕادەمووسم، بمبەخشە، لەهەڵەمان ببورە، لەنەزانیمان خۆشبە...!

دوکتۆر هەوڵ دەدات بەدەنگێکی ئاسایی‌و روویەکی خۆشەوە بدوێت و واپیشان بدات کەلەدەردی‌سەری‌یەکەیان دەگات..

دوکتۆر: خۆت دڵتەنگ مەکە، بەڵکە جارێکی دی رێگەبدات.. هەر دێتەوە، بابزانین ئەودەمە چۆن دەبێت.

سیڤان پارەی دەداتێ. دوکتۆر وەری ناگرێت...

دوکتۆر: پێویست ناکات، من کارێکم ئەنجام نەداوە!

سیڤان شەرمەزارە..

دەڕۆنە دەرەوە...

دوکتۆر لەبێ دەستەڵاتیدا سەر بادەدات، لەو هەڵوێستە نەزانانەیە سەری سوڕماوە...

دوکتۆر: خودایە.. لەسەدەی بیستەمدا.. خودا.. لەوڵاتەکەمدا.. لەسەدەی بیستەمدا...!!!

سیڤان :(بەئەسپایی) ئێستا چاك دەزانم کەدەتەوێت بچیتەوە لای براکانت! ئەوەتان، چاوەڕێتن، بڕۆ... دەی بڕۆ!

لەدەرگەکەوە پاڵی پێوە دەنێت...

خۆی لەدوایەوە دەچێتە دەرەوە..

## 25- حالیلانی‌یان

حالیلانی‌یەکان چاوەڕێ دەکەن، راڤنێ دەبینێت وا بێریڤان دێتەدەرەوە...

سیڤان پاڵی پێوە دەنێت و خۆی لەدوایەوە دێتە دەر..

براکانی هەست دەکەن شتێك رووی‌داوە..

سیڤان خێرا دەڕوات، بێریڤان واسەری نەوی‌کردووە کەچارەی نابینرێت، خێرا رێ‌دەکات... دەیەوێت سیڤان بگرێتەوەو پێ‌بەپێ‌ی ئەو بڕوات... ئەبوزەڕ وریایە. سیڤان لەپێشەوەو بێریڤان بەدوویدا...

چەرچی‌یەکە تێناگات چ ڕوویداوە..

خەڵکی نێوبازاڕەکە شڵەژاون و خۆ لەدووکانەکان دەخزێنن..

حالیلانی‌یەکان لەبەرێکی شەقامەکەو ڤەیسی‌خانی‌یەکان لەبەرەکەی دی‌یەوە ڕێ‌دەکەن...

حالیلانی‌یان کەمێك دوادەکەون و بەوریایی‌یەوە دەڕۆن...

هەردوو بەری شەقامەکە ئاڵۆزی پێوە دیارە..

هەڵوێستی بێریڤان لەرادەبەدەر کاری لەسیڤان کردووە..

نێچیرەڤان: کاکە سیڤان، برا ئەمجارە ڕێگەمان بدە لەگەڵ بێریڤانی خوشکمان بدوێین.. ڕێگەمان بدەن یارمەتیتان بدەین.. رەنگە بتوانین چارەیەك پەیداکەین..!

سیڤان هیچ وەرام ناداتەوە...

ئەبوزەڕ ڕادەوەستێت، بەمۆڕەیەکەوە تێیان دەڕوانێت..

حالیلانی‌یان ڕادەوەستن، سیڤان خێرا دەڕوات..

بێریڤان پێ هەڵدەگرێت تاسیڤان بگرێتەوە، جارجارە ڕادەکات...

نێچیرەڤان: سیڤان

ئەبوزەڕ لەتوڕەیی‌دا دەلەرزێت، گشت گیانی دێتە لەرزین..

نێچیرەڤان: ئەبوزەڕ گەوج مەبە، ئێمە بۆ شەڕ نەهاتووین..!

ئەبووزەڕ بەپۆرخزی‌یەکەوە دەوەستێت.. ڕێگەیان لێ دەبەستێتەوە.. ژەندرمەیەك پالی پێوە دەنێت تا بڕوات..

سیڤان خۆی بەدووکانێکدا دەکات... بێریڤان هەناسە سوار لەدوویەوە دەچێتە ژوورێ.. چەرچی‌یەکەش بەدوویاندا...

### 26- لەدوکانەکەدا

خاوەن‌دوکان بەهاتنی سیڤان دەپەشۆکێت، چاوەڕوانی شتی واناکات، بەڵام واپیشان نادات.. تاسیڤان زوو بەرێ‌بکات، بەپەلە دەست بۆ رەفەیەك درێژ دەکات...

دوکاندار: لەئەنقەرەوە بروسکەیەکتان بۆ هاتووە.

بروسکەکە دەدۆزێتەوەو دەیداتە دەستی...

دوکاندار: جامبازەکان دەیانەوێت تاسەری مانگ مێگەلەکەیان بگەیەننێ، دەبێت بیگەیەننە ئەنقەرە.. ماوەتان کەمە.. دەڵێن پێویستە پەلە بکەن...

سیڤان: بەڵێن وابوو کارێکم بۆ پەیدا بکەیت، لەسەر گفتی خۆت ماویت؟

دوکاندارەکە بەترسەوە چاوەدێری حالیلانی‌یان دەکات کەلەپێش دوکانەکەدان. بیردەکاتەوە چۆن پاڵ بەسیڤانەوە بنێت.. لەوەدەمەدا چەرچی‌یەکە دێتە ژوورێ...

دوکاندار: جارێ نازانم، پاشان لەوبارەوە دەدوێین.. جارێ پێویستە ئێوە مێگەلەکە بگەیەننە ئەنقەرە.

سیڤان: جارێ نازانرێت من لەگەڵدا دەچم یان نا..!

دوکاندارەکە بەردەوام دەڕوانێتە دەرەوە..

دوکاندار: بەراستی‌ی نازانم. بۆ دەسخستنی کارێکی ئاوها، دەبێت شەست هەزار پارەت هەبێت..!

سیڤان: هێندەم نی‌یە.. بەڵام کلاشینکۆفێکم هەیە.. سی هەزارێك دەکات دەیفرۆشم..

دوکاندار: هیچی بۆ من تێدا نی‌یە، من بۆ تۆی دەکەم! داوای شەست هەزار دەکەن...

سیڤان پەشێوی‌ی کابرا هەست پێ دەکات.. ئاورێك دەداتەوەو سەیرێکی دەرەوە دەکات..

چەرچی: ڕۆژێك بەتایبەت دێینە لات و لەو بارەوە دەدوێین.. سیڤان، بڕوانە، وەزعەکە ئاڵۆزە، بەهیوام تێمان بگەیت..!

ئەبوزەڕ بەردێك دەگرێتە حالیلانی‌یان..

### 27- شەقامی شارەکە

بەردەکە جامخانەیەك دادەبێژێت.. خاوەن دوکانەکە بەتوڕەیی‌یەوە دێتەدەرەوە.

دوکانداری دووهەم: هۆو شێتە چ دەکەیت، دەتەوێت سەری ئێمە بشکێنیت؟

نێچیرەڤان: ئەبوزەڕ، ڕەفتاری منداڵانە مەنوێنە.. خراپتری مەکە، تێکی مەدە..

ژەندرمەیەك ئەبوزەڕ دووردەخاتەوە.. سیڤان و بێریڤان لەدووکانەکە دێنە دەرەوە..

نێچیرەڤان: سیڤان، بەبرا فێ‌گرتوەکەت بڵێ وەك پیاو ڕەفتار بکات، دەنا خەراپ ڕوودەدات... دان بەخۆداگرتنی ئێمەش سنووری هەیە!

سیڤان: سنووری دان‌بەخۆدا گرتنتان تا کوێ‌یە؟!

باران: سیڤان، پیاو لەڕەفتاری تۆش تێناگات! یا ڕێگەمان بدە لەگەڵ خوشکەکەمان بدوێین، یاخود ئاشکرا بڵێ ڕێگە نادەم.. ئازا بە.. چت لەدڵدایە ئاوها ڕەفتار بکە..

سیڤان: دەخوازن لەگەڵ خوشکەکەتان بدوێن؟

شانی بێریڤان دەگرێت و بۆلای براکانی‌یەوە پالی پێوە دەنێت...

سیڤان: ئەوە خوشکەکەتان، چتان هەیە پێی بڵێن! ئەوجا بزانین سنووری دان‌بەخۆداگرتنتان تاکوێ‌یە..! چتان دەوێت؟ خوێن؟

بێریڤان ڕادەکاتەوە پشتی سیڤان...

سیڤان دەڕوات و بێریڤانیش بەدوویدا...

باران: بێریڤان؛ تۆ شەرەفی ئێمەو خانەوادەکەمانیت.. بمانبەخشە، تێگەیشتین کەهەر لەسەرەتاوە هەڵەمان کرد.. تۆمان کردە قوربانی ئەو کوڕی سەگانە..

سیڤان کەوشەی (کوڕی سەگ) دەبیستێت، یەکەو ڕاست وەردەچەرخێت.

بەڵام دەبینێت چۆن نێچیرەڤان لەپەناگوێ‌ی باران دەسرەوێنێت و دەمی پێ دادەخات.. سیڤان زۆر هەڵدەچێت، بەڵام هەڵوێستەکەی نێچیرەڤان خاوی دەکاتەوە..

ئەبوزەڕ بەدووی بەردێکدا دەگەڕێت تا تێیان بگرێت.. سیڤان دەیگرێت و هەلی دەشلەپێنێت..

سیڤان: لێ گەڕێ، شێتە، ئێستا وەختی بەردهاویشتنە؟ منداڵیت؟

نێچیرەڤان بێریڤان بانگ دەکات..

نێچیرەڤان: بێریڤان؛ دەبێت هەرچۆنێك بێت ڕێگەیەك پەیدا کەین تا لەگەڵت بدوێین. خوشکەکەم، دەردەدڵی خۆتمان بۆ هەڵڕێژە. بەو دوکتۆرەت نەگوت، بەئێمەی بڵێ. چ بکەین؟ پێمان بڵێ چ بکەین؟ تۆ چۆنت پێخۆشە ئێمە ئاوها دەکەین. گەر بڵێیت لەگەڵ خۆتانم بەرنەوە، هەر ئێستا دەتبەینەوە! گەر



هاتنەوەت دەوێت، ئامێزمان ئاواڵەیە، ماڵەکەمان چاوەڕێتە! هەڵەی ئێمە بوو ئاشتیمان ویست. تۆمان کردە قوربانی ئاسوودەیی خۆمان! تۆ کرایتە قوربانی ئاشتی!

ژەندرمەیەك خەریکە ئەبوزەڕ بگرێتو پێشی دات، بەڵام چەند کەسێك دەکەونە بەینەوە تا وەزعەکە ئاڵۆزتر نەبێت.

ئەبووزەڕ لەتوڕەیی‌دا دەلەرزێت. بەردێك دەگرێتە نێچیرەڤان، نێچیرەڤان خۆی لادەداتو بەردەکە جامخانەی دوکانێك دێنێتە خوارەوە..

دوکاندارێك نەبڕایەوە؟ ئێوە لەیەکدی ئاڵۆزن، دەبێت ماڵی خەڵکی وێران کەن؟ گەر دەتانەوێت لەیەکدی بەربن بچنە جێیەکی دی..سیڤانو بێریڤان دەڕۆن، ئەبوزەڕیش بەدوویاندا...

خەڵکەکە بەملاوئەولادا بڵاوبوونەتەوەو دەڕواننە بارە ئاڵۆزەکە، خەڵکیی ئەو دوکاندارانە هێوردەکەنەوە کەجامخانەکانیان شکاوە..

لەپڕ ئەبوزەڕ فێ دەیگرێت. لەنێوەڕاستی بازاڕەکەدا دەکەوێت، لەشی ڕەپ دەبێتو دەلەرزێت، خەڵکی لێی کۆدەبنەوە، سیڤان بەراکردن دەگاتە سەری، بێریڤان لەشوێنی خۆی رادەوەستێت..

سیڤان هەوڵ دەدات لەپی ئەبوزەڕ بکاتەوە.. چەند کەسێك رادەکەن، یەکێك کۆڵۆنیا دەهێنێت بەبەرلوتی‌یەوە، یەکێك پەڕۆ دەسوتێنێتو بۆسۆی بۆ دەکات.. هەندەك پێدەکەنن.. هەندەك بەزەییان پێدا دێتەوە.. بەشێواوی‌و تێکچوونی دەموچاوەکان ئاڵۆزی بارەکە نیشان دەدرێت...

حالیلانی‌یەکان هەلەکە دەقۆزنەوەو لەبێریڤان دەئاڵێن.. ئەویش یەکەیەکە لەرووخساریان دەڕوانێت، پاشان سەر دادەخات..

نێچیرەڤان: بێریڤان خوشکەڵێ؛ بمانبەخشە.. ئازارمان دایت، تازە هەست دەکەین ئەگەرچی درەنگیشە..! ئاشتی دەرفەتێکی چاك دەبوو بۆ گشت لایەکمان، بەڵام نەهاتە دی.. چت بۆ بکەین؟ پێمان بڵێ چیتە. گەر ئارەزوو دەکەیت لەگەڵمان وەرە... خەڵکی هەرچی دەڵێن با بڵێن.. خۆت بڕیار بدە.. هەرچۆنت پێ خۆشە ئێمە وادەکەین.. تۆ بەلای ئێمەوە گرنگیت! دەڵێی چی؟

بێریڤان سەری نەوی کردووەو وەك بێگانەیەك لەنێویاندا وەستاوە.. ناڕوانێتە دەموچاوی کەسیان..

راڤنێ: گەر دەخوازیت هەر ئێستا دەڕۆینەوە! تەنها بڵێ بەڵێو هیچی دی.. هەر ئێستا دەڕۆین..!

قۆڵی بێریڤان دەگرێت، بێریڤان خۆی رادەپسکێنێت..

نێچیرەڤان: دەمەوێت یەك شت بزانم، بێریڤان؛ بیری لێ بکەوە ئەوجا وەرامم بدەوە؛ لەمێردەکەت رازیت؟ گەر خۆت مێردەکەت بەدڵ بێت ئیدی ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین..! مێردەکەتت دەوێ؟ بەیەك وشە، بەڵێ یان نەخێر؟ دەتەوێت یان نا؟

بێریڤان سەیرێکی سیڤان دەکات.. ئەویش لەگەڵ ئەوەشدا کەبەئەبوزەڕەوە خەریکە چاو لەچاوەکانی دەبڕێت..

بێریڤان تێی دەڕوانێت ئەشك دەپەڕێتە چاوەکانی.. ئەوجا دەڕوانێتە براکانی‌و سەری رەزامەندی دەلەقێنێت..

نێچیرەڤان: ئەی مێردەکەت تۆی بەدڵە؟ کۆمەکت دەکات..! پشتت دەگرێت؟

بێریڤان سەر دەلەقێنێت.. چاوەکانی زێتر ئاویان تێ دەزێت..

نێچیرەڤان: کەواتە ئێمە ناتوانین هیچ بڵێین، بەڵام گەر بیرت گۆڕی، ئێمە هەمیشە ئامادەین بەخواستی تۆ بکەین، خودات لەگەڵ بێریڤان، ئێمەت لەگەڵین، مێردەکەتت لەگەڵدایە.. خودا ئاگادارت بێت.. ئیدی ئێمە هیچی دیکەمان نی‌یە بیڵێین..

بێریڤان ملی بەلارەوە گرتووەو بیردەکاتەوە..

نێچیرەڤان: مێردەکەتت خۆش دەوێت؟ ئەویش تۆی خۆش دەوێت؟ دەخوازن پێکەوە بمێننەوە؟

بێریڤان سەردەلەقێنێت...

نێچیرەڤان: ئیدی ئێمە ڕێمان ناکەوێت هیچ بڵێین.

نێچیرەڤان کیسەیەك پارە لەگیرفانی دەردەکات و دەیداتە بێریڤان...

نێچیرەڤان: بگرە، ئەمە تەنها بۆ خۆت نا، بۆ سیڤانیش، تۆ ناساغیت.. پارەتان نی‌یە.. دەزانین.. ئاگادارین کەسیڤان لەکار دەگەڕێت.

بێریڤان پارەکە وەرناگرێت..

نێچیرەڤان: خۆت چاکتر دەزانیت، خوشکەڵێ.. خوداتان لەگەڵ..

قەرەباڵغی‌یەکە هێواش هێواش دەڕەوێتەوە... براکانیشی دوعاخوازی لەبێریڤان دەکەن..

سیڤان دەبینێت ئەوان دەڕۆن.. لەو دەمەدا ئەبوزەڕیش دێتەوە سەرخۆی.. سیڤان هەڵیدەستێنێت.. سەرو چاوی شڵپەی دێت لەکۆڵۆنیاو ئاودا..

کاتێك حالیلانی‌یەکان بەدڵگرانی‌یەوە لەخوشکەکەیان دوور دەکەونەوە، بەدەم ڕێگەوە هەر ئاوڕی لێ دەدەنەوە.. بێریڤانیش لەدوویان دەڕوانێت.. ڕاڤنێ چاوەکانی دەسڕێت..

سیڤان دێتەوە لای بێریڤان.. لەروخساری دەڕوانێت، دەڕوات. بێریڤان دووی دەکەوێت.. ئەبوزەڕیش بەلارەلار دەکەوێتە شوێنیان. سیڤان خۆی زۆر بەبەختەوەر دەزانێت، چونکە لای ئاشکرا دەبێت کەژنەکەی بەراستی خۆشی‌دەوێت..

## 28- مێگەلەکە

سیلۆ لەدیار رانەمەڕەکەیە.. شانی داداوەو بلوێر دەژەنێت.. پاش پیشاندانی وێنەی ئاڵۆزی شارەکە، ئارامی‌و کپی مێگەلەکە نیشانەی دووجۆر باری ژیانن..

هەڵبەزین و یاری‌کردنی مەڕێك لەگەڵ گەماڵێکدا، دۆستایەتی دێرینەی مەڕو سەگ بەدەر دەخات.. جوانی سروشت و ڤڕەی تراکتۆرێك کەلەدوورەوە زەوی دەکێڵێت، بەلەقتەی کورت و خێرا نیشان دەدرێن..

سیلۆ چەرچی‌یەکەو سوارێکی دی بەدی‌دەکات کەبەرەو لای ئەم دێن، رائەچڵەکێت..

چەرچی: کوڕم، سیلۆ، چۆنیت؟ باشیت؟

سیلۆ: باشم، زۆر باشم..

چەرچی‌یەکە هێشتا تەواو



نەگەیشتوەتە جێ، ئیشارەتی بۆ دەکات..

چەرچی: وەرە، وەرە بزانە چ هەواڵێکی خۆشم بۆ هێناویت..!

سیلۆ بەو بزۆزی‌و هەرزەکاری‌یەیەوە بەرەو رووی رادەکات..

چەرچی: هەواڵێکی خۆشم پێ‌یە، هەواڵێکی خۆشی وا گەر تۆزێك ژیر بیت هەموو شت بەدڵی خۆت دەبێت.. ئیدی نازانم..!

سیلۆ تێناگات، هەوڵ دەدات لەمەبەستی بگات...

سیلۆ: بەهیوام هەواڵێکی چاك بێت...

چەرچی: بێگومان چاکە...! کەی ئێمە هەواڵی ناخۆشمان پێ بووە!

لەئەسپەکانیان دادەبەزن...

چەرچی: بڕوانە سیلۆ، ئائەمە فەرمانبەری میری‌یە... جگە لەوە دوکاندارو رۆژنامەنووسیشە.. پێش چەند رۆژێك چەند قاپولکەیەکت دامێ. نیشانی ئەمم دان و ئەمیش زۆری بەدڵبوون...

سیلۆ: قاپولکە؟ ئاها... ئەوەی کشمیش و لوقمەت لەبریتی‌یان داینێ...!

چەرچی: بەڵێ، کشمیش و لوقم...

چەرچی‌یەکە هەردوو قاپولکەکە لەخورجەکەی دەردێنێت...

چەرچی: سیلۆ، بڕوانە، گەر پێمان بڵێیت ئەمانەت لەچ جێ‌یەك دۆزیونەتەوە، ئەوا یەك پێنج سەدیت دەدەینێ..!

سیلۆ: چی؟ پێنج سەدی؟ پێنج سەدی چی‌یە؟

دوکاندارەکە: ئەوانە شتێکی جوانن.. من دوکاندارم.. سیڤان دەزانێت.. گەر یارمەتیمان بدەیت، ئەوا تۆش شتێکت دەست دەکەوێت! چەند دانەی دیکەی لێ‌یە؟

سیلۆ: بۆچی ئەوانە شتێکی گرانبەهان؟ بەکەڵکی چ دێن؟

چەرچی: نا، گەڕیدەکان حەزیان لێ‌یە.. تۆدەزانیت گەڕیدە گەوجن... کەشتێکی ئاوها کۆنە دەبینن، پێ‌یان وایە بەنرخە..!

دوکاندار: ئەمانە لەگەرماودا لەبریتی بەردەپێ بەکار دەهێنن...ئەوان هەمیشە سۆلیان لەپێدایە.. بەمانە پێ‌یان پاك دەکەنەوە...!

سیلۆ: من بەردەپێ‌ی باشتر پێ دەزانم...

چەرچی: گەمژە، ئەوان گەڕیدەن، تەنها حەزیان لەو جۆرانەیە کەوێنەیان لەسەر هەڵکەنراوە..! تائێستا گەڕیدەت نەدیتووە؟

سیلۆ: یەك دوانێکم دیتوون..! یەکی توورەکەیەکیان بەکۆڵەوەیە... دەڵێیت بارکێشن..! پرچیان بەرداوەتەوە...!

چەرچی: لەگەڕیدەو مەڕیدە گەڕێ... ئێستا چەندی دیت هەن پێمان بڵێ..

سیلۆ: نا، چاکە.. چەند دانەیەك..!

چەرچی : چەندە؟

سیلۆ: نازانم چەندێکن.. بەڵام هەندێکم هەن..

دوکاندار: زۆرن؟

سیلۆ: پێم بڵێن.. چی‌یان لێ دەکەن..!

لەمنجەمنجی سیلۆ تێدەگەن کەهێشتا زۆری هەیە...

دوکاندارەکە دەمانچەیەك دەردێنێت، بەڵام دەمانچەیەکی زۆر جوان و بەنرخ نا...

دوکاندار: سیلۆ؛ بڕوانە کوڕم.. ئائەم چەکە چاکە هەر قابیلی لاوێکی وەکی تۆیە... گەر ئەو ئەشکەفتەمان پێ نیشان بدەیت و ژمارەیەکی زۆری لەمانەی تێدا بێت، ئەوا ئەم دەمانچەیەو پێنج سەد لیرەیی یەکت دەدەینێ...!

چەرچی: ها کوڕم.. قەت پێنج سەدیت دیتووە؟ لەوەگەڕێ.. پێمان بڵێ..

سیلۆ: پێم بڵێ ئەمانە چین؟

چەرچی: گوتمان پارچە بەردی جوانن و لەگەرماودا بۆ پێشتن بەکاری دەهێنن...!

سیلۆ: جا ئەم هەمووە؟

چەرچی: ئاخخخ گەوجە! خۆ هەمووی یەك گەڕیدە بەکاریان ناهێنێت..! هەزاران گەڕیدە هەن کەئەمانە دەکڕن..! یەکی چل پەنجا لیرەیەك دەکەن.. گەر زۆر بن ئەم دەمانچەیەت دەدەینێ، گەر زۆریش نەبن ئەوا یەکی بیست لیرە.. تێ دەگەیت؟ ئێمەش خۆدەبێت شتێکمان دەست کەوێت..! گەر حەزیش ناکەیت ئەوا بەگەڕیدەو مەڕیدەیان نافرۆشین..!

سیلۆ: دەمانچەکە زۆر جوانەو بەدڵمە، بەڵام من پارەم دەوێت... جێگەکەیشیتان پیشان نادەم.. خۆم دەگەڕێم و چەندم دۆزی یەوە دەیانهێنم.. بەڵام نابێت کەس بزانێت.. دەبێت بەڵێنم بدەنێ بەکەس نالێن.

چەرچی: چ دەبێت گەر خەڵکیش بزانن، سیلۆ؟ چ عەیبێکی تێدا نی یە..!

سیلۆ: لەگەڵ ئەوەشدا...!

بیر دەکاتەوە

سیلۆ: کەواتە هەریەکەی بەبیست لیرە.. نا، نەخێر، بیست کەمە..! بیست و پێنج..!

چەرچی: ئا، چاکە لەبەر خاتری تۆ..!

سیلۆ: سبەی زوو دەیانهێنم و دەستبەجێ پووڵی خۆم دەوێت.. بەڵام بەمەرجێك کەستان دووم نەکەون.. سبەی پاش هەتاو کەوتن لە (*.....*) یەکدی دەبینینەوە.

چەرچی: زۆر چاکە سیلۆ...

لەو دەمەدا سیڤان و بێریڤان لەدوورەوە بەدەردەکەون..

چەرچی: پێویستە پەلە بکەیت... چونکە دەبێت تاسەری مانگ مێگەلەکەتان بگەیەننە ئەنقەرە.

سیلۆ: ئەنقەرە؟

چەرچی: ئاااا، کافر... بەگیرفانی پڕەوە دەچیتە ئەنقەرە! ئەم هەموو ژن و کیژە شۆخە..! ئۆف، ئۆف..!

سیلۆ: بەڵام نابێت بەکەس بڵێن... کەس نابێت پێ بزانێت...

چەرچی: کەواتە تۆش نابێت لای کەس باسمان بکەیت، باشە؟

سیلۆ: چاکە...

لەلەقتەیەکدا ئەبوزەڕو سیڤان و بێریڤان لەدوورەوە نیشان دەدرێن.. سیڤان بیردەکاتەوە، بێریڤانیش لەپشتی هێسترەکەوە سواربووەو بیردەکاتەوە. ئەبوزەڕ شەکەت و ماندووە..

سیڤان دوو سوارەکە دەبینێت لەسیلۆ جودا دەبنەوە، بەوریایی یەوە تێ یان دەڕوانێت...

### 29- دەوارەکان

یەکێك لەشوانەکان بروسکەکەیان بۆ دەخوێنێتەوە..

حامۆو ئەبوزەڕو شوانەکان و ژنەکان دانیشتوون.. سیڤان و بێریڤانیان لەنێودا نین...

میرزا: زێدە بەڕێز جەنابی حامۆی ڤەیسی خانی... بەهۆی (ئەیوب ئەسلانی)ی کوتاڵفرۆشەوە لە (پەرڤەری[4])...

(وەکی ڕێککەوتین، پێویستە لەسەرەتای مانگدا خۆتان و دووسەد سەرمەڕ بگەنە ئەنقەرە، گەر دوابکەون، ئۆباڵەکەی لەئەستۆی خۆتانە، سەفەرێکی خۆش، سلاو بۆ گشت لایەك)

(Cecll Tac)

حامۆ پەشێو دیارە..

حامۆ: لەڕاستی دا ئێمە زیانمەندی ئەم سەوداو مامەڵەیەین...!

میرزا: بۆچی؟

حامۆ: واپێدەچێت ئاوها بێت..!

ئەوجا روونی دەکاتەوە بۆ زیانمەندن.. پێشنیاز دەکات گشت لەگشتی مەڕەکان بەرنە ئەنقەرەو بیانفرۆشن...

### 30- دەوارەکەی سیڤان

سیڤان و بێریڤان خۆکۆدەکەنەوە... مرۆ هەست دەکات کەخۆ بۆ سەفەر ئامادەدەکەن...

ئەبوزەڕ دێتە کنیان...

ئەبوزەڕ: بابم بانگت دەکات...

سیڤان کەمێك بیر دەکاتەوە... ئەوجا دەست لەکار هەڵدەگرێت.. ئەبوزەڕ هەست دەکات کە خۆ دەپێچنەوە...

ئەبوزەڕ: ئەوە چ دەکەن؟

سیڤان: خۆکۆدەکەینەوە...!

ئەبوزەڕ: بۆ؟

سیڤان: بار دەکەین..

ئەبوزەڕ: بابام بەوەی دەزانێت؟

سیڤان: نەخێر

ئەبوزەڕ رادەکات...

بێریڤان کەوەکانی هەڵدەگرێت...

لەوکاتەدا حامۆ دێت...

حامۆ: ئەبوزەڕ شتێکی گوت، راست دەکات؟

سیڤان: راستە، ئێمەش لەهەڵپەی ژیانی خۆماندابن... بێریڤان ناساغە، پێویستی بەچارەسەری یە... لەمن زێتر کەسی دی شك نابات! پێم وایە لیرە هێندەمان نان و ئاو زۆرە...! بڕیارم دا کەبڕۆین...

حامۆ: یانی دەڕۆیت...؟! ئالەم کاتەدا کەپێویستە مێگەلەکە بەڕێ بخەین...!

سیڤان: خۆ پێویستتان بە من نی یە... هەموو کەس دەتوانێت مێگەلێك وەبەردات... ئەوە هونەرێك نی یە...

حامۆ: ئەمەی تۆ دەیڵێیت یانی من ڤەیسی خانی نیم.. من حالیلانیم، کۆیلەیەکی حالیلانیم...!

سیڤان: ئارەزووی خۆتە بابە، من سەبرم سوا، مردین، چەندین ساڵە زوخاومان دەدەنێ، بەمنیش و بێریڤانیش... تۆزقاڵێك بەزەیی لەدڵتاندا نەبوو...! ئەوە دواگوتەی منە.. بێریڤان حالیلانی نی یە، بەڵکە ڤەیسی خانی یەو تاماویشە بەڤەیسی خانی دەمێنێتەوە...

حامۆ ردێنی هەڵدەکرێنێت... مرۆ هەست دەکات کەبیر لەشتێك دەکاتەوە...

حامۆ: ئێستا یانی لەگەڵمان نادێیت؟

سیڤان: نادێم...!

حامۆ: ئەمە بۆ ئێمە، بۆ ڤەیسی خانی دوا هەلی ژیانە، سیڤان؛ دواهەل...! گشت لەگشتی مێگەلی خێڵ دەبەین بۆ

48

ئەنقەرە... بەڵێنی سێسەدو پەنجا سەرمان داوەو پارەکەشمان وەرگرتووەو هەر بەسەوزی خواردوومانە...! بۆیە بڕیارمان داوە پێنجسەد سەر بەرین، سەرپاکی مەڕی خێڵەکە...! جا ئەگەر ئەو سەدو پەنجا سەرە پارەیەکی چاکمان بۆ بکات ئەوا دەتوانین زستان بەسەربەرین و تاساڵی نوێ بژین، دەنا زستان لەبرساندا دەمرین.. ئەوە تەنها هیوامانە.. بۆت نی یە بەهیچ لایەکدا بڕۆیت... بیرکەرەوە... بڕیار بدە... تۆمان پێویستە...!

حامۆ لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا کەللەڕەقی خۆی نیشان دەدات...

سیڤان ماوەیەك بیردەکاتەوە...

سیڤان: گەر من لەگەڵدا بێم، مەرجی خۆم هەیە...!

حامۆ: مەرج؟ مەرجی چی؟

سیڤان: گەر من لەگەڵدا بێم ئەوا دواهەمین جارە.. ئەمە یەك.. پاشان لێتان جودا دەبمەوە... دووهەم، گەر من بێم ئەوا بێریڤانیش لەگەڵ خۆ دێنم.

حامۆ: بێریڤان بۆ چ لەگەڵدا بێت؟

سیڤان: بێریڤان نەخۆشەو پێویستی بەچارەسەری هەیە. دەبێت لەوێ بیبەینە لای دوکتۆر... جگە لەوە دەبێت هەر گەیشتینە ئەنقەرە یا چەند ڕۆژێك دواتر، دەهەزار لیرەم بدەنێ و ئیدی من دەستبەرداری گشت هەق و مافێکی خۆم دەبم...!

حامۆ: دەهەزار لیرە بۆچی؟

سیڤان: بۆ چارەسەرکردنی بێریڤان... جگە لەوە، ئیدی من دەڕۆم و لەگەڵتان ناگەڕێمەوە... قرۆشێك شك نابەم... دەمەوێت لەشار نیشتەجێ بم و بۆخۆم کارێك پەیدا دەکەم... لەنێو ئێوەدا نانم بەئاودا ناگات... لەنێوتاندا بوومەتە بێگانە.. بێریڤان ناساغە.. گەر من بێم، تەنها لەبەر خاتری ئەو دێم. بۆ ئەوە دێم ئەو بەرمە لای دوکتۆر... بێریڤان گیانی بەبەرەوە نەماوە.. گەر بمرێت تاوانی لەملی هەموومانە... مەرگەساتێکە بۆ خۆی...!

حامۆ بۆ یەکەم جار خۆی بێدەسەڵات دێتە پێش چاو.. بیر دەکاتەوە.. بەتوڕەیی یەوە سەربادەدات، بەڵام بێدەستەڵاتی یەکەشی ناشارێتەوە...

حامۆ: وەرە، وەرە کەمێك قسان بکەین.

باب و کوڕ لەخێوەتەکان دوور دەکەونەوە..

حامۆ: وەرە گوێ ڕاهێڵە... با بێریڤان نەیەت.. ئەو نەفرەت لێکراوە، شوومە، بەدبەختی دونیامان بەسەر دێنێت..!

سیڤان: بێریڤان نەخۆشە، بێ دەستەڵاتە، شووم نی یە..!

حامۆ: گەر بێریڤان لەگەڵمان بێت، بەدبەختی بەرۆکمان بەرنادات..! گشتمان دەفەوتێین.. ئەم مێگەلە دوا هیوای خێڵەکەمانە.. ئەوە چارەنووسی ژیانمان دیاری دەکات، داخۆ دەتوانین زستان دەربەرین یان نا...!

سیڤان: گەر بێریڤان نەبەین، منیش نادێم، ئەوە دوا گوتەی منە، حامۆ بیر دەکاتەوە...

حامۆ: ئەمە یانی دەستنانە بینمان و خنکاندنمان.. نەفرەتی خودات لێ بێت.. ڕۆڵە نمەكگیرم بیت..

بەتوڕەیی یەوە دوور دەکەوێتەوە.. سیڤان تێی دەڕوانێت.. حامۆ لەپڕێکدا رادەوەستێت.. بەتووڕەیی یەوە دەست رادەوەشێنێت و دەست بەقسەدەکات..

حامۆ: مەرجەکانت پەسەند دەکەم.. چارم نی یە.. بەڵام تەنها بۆ ئەوەی ئیدی لەدەست خۆت و بێریڤان رزگاربم، لەبیرت نەچێت.. خودا خۆت و بێریڤانیش لەقوڕ نێت، هەرهەمووتان..!

دەڕوات...

## 31- کازیوە

دوکاندارەکەو چەرچی یەکەو سیلۆ.. سیلۆ قاپولکەکان دەژمێرێت..

سیلۆ: هەشتاویەك، هەشتاو دوو، هەشتاو سێ، هەشتاو چوار، هەشتاو پێنج...

دوکاندارو چەرچی یەکە بەوریایی یەوە لەگەڵی دەژمێرن...

سیلۆ: هەشتاو شەش، هەشتاو حەوت، هەشتاو هەشت، هەشتاو نۆ... دوانەکەی جاری پێشووش، ئەوە نەوەدو یەك..

دوکاندار: ئەمە هەموویەتی؟

سیلۆ: هەموویەتی..

دوکاندار: ناشێت هەمووی بێت..! جوان بگەڕێ سیلۆ.. رەنگە هەندێکی دی لێ مابێت...

چەرچی: رەنگە بەو تاریکی یە هەندێکت نەدیتبن..

سیلۆ: ئەمە هەموویەتی، پووڵەکەم بدەنێ..!

چەرچی: پووڵ کەماڵی نی یە، سیلۆ.. دەبێت هێشتا هەندێکی دیکەی لێ مابن...

سیلۆ: هیچی دی لێ نەماون..

دوکاندار قەڵەم و کاغەزێك لەگیرفانی دەردەکات و دەچێتە بەر ڕۆشنایی یەکەو حسێبی دەکات..

دوکاندار: چەند دانە بوون؟ نەوەدو یەك.. نەوەدو یەك جار بیست و پێنج؟ دوو کەڕەت یەك؛ هەر دوو.. دوو کەڕەت نۆ؛ هەژدە.. پێنج کەڕەت یەك؛ هەر پێنج.. پێنج کەڕەت نۆ دەکاتە چل و پێنج.. پێنج، حەوت.. هەشت و چوار دەکاتە دوازدە، دووجاردوو.. هەمووی دەکاتە دووهەزارو دوسەدو حافتاوپێنج لیرە..

پارەکە دەردەکات..

دوکاندار: ئەوە دووهەزارو سێسەد.. ئەوە بەشی خۆت! ئێستا رازیت؟ باوەڕومان پێ دەکەیت؟

سیلۆ بەشڵەژاوی یەوە پارەکە وەردەگرێت. قەت هێندەی پارە نەدیتووە..

چەرچی: کەی بۆ ئەنقەرە بەرێدەکەون؟

سیلۆ: یەك دوو ڕۆژی دی...

دوکاندار: سیلۆ؛ بڕوانە، رەنگە هەڵەیەك لەمەسەلەکەدا هەبێت.. جارێکی دی چاو بگێڕە، بزانە لەسووچێك لەپەنایەکدا هیچی لێ نەماوە..! هەرچی مابێت لێت دەکڕین.. لەبەر ئەوەی ئەمجارەیان خۆت ماندوو دەکەیت، یەکی سی لیرەت دەدەمێ..!

سیلۆ: سی لیرە؟

دوکاندار: سی لیرە!

چەرچی: ئاخ خ خ خ کوڕە گێلەکەم..! گەر هەنەك لەسووچێك پەنایەکدا مابن، دەبێت بۆ دۆزینەوەیان ئەمجارە خۆت زێتر ماندوو بکەیت... ئەوە لەبەر ئەوەیە! ئایا خراپ دەکەین گەر بیر لەتۆش بکەینەوە؟ دەنا بۆ ئێمە هەموویان یەك نرخن..

دوکاندارەکە قاپولکەکان لەکیسەکەی دەکات و دەیخاتە سەرپشتی قاترەکەی..

سیلۆ دەنگی مێگەلەکە لەدوورەوە دەبیستێت...

سیلۆ: سبەی دەمی خۆرهەلات یەکدی دەبینینەوە.. جارێکی دی چاودەگێڕم دەڕوانم بزانم هیچی دیکەی لێ نییە.. بەڵام ئەمجارە بە سی لیرە نا..

چەرچی: ئەی بەچەند؟

سیلۆ: بەسیو دوو لیرە..!

دوکاندار: باشە سیلۆ، با ئەویش خاتری تۆ بێت..

تادەنگی مێگەلەکە نێزیکتر دەکەوێتەوە، سیلۆ زێتر دەشێوێت.. شڵەژاوی‌یەکەی لەگەڵ دەرکەوتنی سیڤاندا ئاشکراتر دەبێت.. ترسی ئەوەی هەیە مەسەلەکەی ئاشکرا بێت..

چەرچی: سیڤان دەچیت بۆ کوێ؟

سیلۆ: دەچێت بۆ لای بەڕێوەبەری وێستگەی شەمەندەفەر.. دوو سبەی شەمەندەفەرێك دەڕوات.. دەچێت لەگەڵ بەڕێوەبەردا قسە دەکات و چەند فارگۆنێك بەکرێ‌دەگرێت...

چەرچی: من پێم وابوو سیڤان لەئێوە جودا دەبێتەوە..!

سیلۆ: کاتێك کەگەڕاینەوە، ئەوجا..

چەرچی: سیلۆ؛ مادامێکی لێرەین، ئێستا قاپولکەکانمان بدەرێ.. باسبەی هەمدیسان نەیەینەوە..

سیلۆ: سبەی بەیانی..!

سیلۆ پارەکەی لەباخەڵیدا دەشارێتەوەو دەستی پێوەدەگرێت و غار دەدات. تادێت دەنگی ئەبوزەڕو مێگەلەکە نێزیکتر دەبێتەوە...

چەرچی‌یەکە لەسیڤان دەڕوانێت کەبەسواری‌ی بەرەو شار دەڕوات.. دوکاندارەکە نەخشەیەك دەردەهێنێت.. تێ‌ی دەڕوانێت.. بیر دەکاتەوە...

دوکاندار: دەبێت هێشتا سێ‌و سێ‌دانەی لێ مابێت.. ئەم لاوە هەموویمان بۆ دەهێنێت، هەمووی دەهێنێت.. بەڵام ئومێد دەکەم کەهیچ گەوجێتی‌یەك نەنوێنێت..

چەرچی: بەکەس ناڵێت.. دەیەوێت پووڵەکەی لەهەموویان بشارێتەوە!

دوکاندار: بەهیوایین

دەنگی گۆرانی سیڤان دەبیستریت..

### 32- سیڤان بەرێگەوە

سیڤان بەسواری هێسترێکەوە،



گۆرانی‌یەکی خەمگین دەچرێت... سیڤان لەچەند گۆشەنیگایەکی جوداوازەوە نیشان دەدرێت... بۆ یەکەم جار لەلەقتەیەکی نێزیکدا تراکتۆرێك دەبینین کەچرنوك لەزەوی دەگرێت.. زەوی‌یەکە هەڵدەدرێت و وەردی دەداتەوە.. ئەمە نیشانەیەکی هەڵتەکاندنی پێوەندی‌ی دەرەبەگایەتی بەدەردەخات...

### 34- دەوارەکان

سیڤان لەنێوەڕاستدا هەڵتروشکاوە.. حامۆو ئەبوزەڕو سیلۆو شوانەکانی دی لەدەوری خڕبوونەتەوە.. منداڵانیشی لێن.. رووخساری خەڵکەکە نیگەرانی‌ی بەدەردەخات.. ژنان خەریکی کارو فرمانی رۆژانەی خۆیانن، بەڵام جار جارە گوێ‌یەکیش بۆ گوتەی پیاوەکان هەڵدەخەن..

سیڤان: من خۆم لەوێ بووم و بۆم ئاشکرابوو کەحاڵەتەکە خەراپتربووە.. لە مارتەوە کرێ‌ی شەمەندەفەر هێندە زیادی کردووە کەلەحسێب نایەت.. کرێ‌ی فارگۆنێك تا ئەنقەرە دووقات زیادی کردووە..

حامۆ: ئێمە پارەی مەڕەکانمان بەر لەشەش مانگ وەرگرتووە.. ئەودەمە کرێ‌ی شەمەندەفەر وابەرز نەبووبووەوە... کێ دەبێت ئەو پارەیە بدت؟ ئاشکرایە ئێمە!

سیڤان: ئێستا کرێ‌ی یەك تەن هەشت سەدو هەشتاو هەشت لیرەیە!

میرزا: ئەوانە چەتەن!

سیڤان: جاران دەتوانرا نەوەدو شەش سەر بئاخنرێتە فارگۆنێکی بیست مەتر چوارگۆشەیی‌یەوە.. ئێستاکە تەنها رێگەی هەشتا سەر دەدەن..!

حامۆ: ئێمە پێنج سەد تا پێنج سەدو بیست سەرمان هەیە، چەند فارگۆنمان پێ‌دەوێت؟

سیڤان: بەلای کەمەوە شەش فارگۆن.. بەپێ‌ی یاسای نوێ، دەبێت مێگەلەکە بەلای کەمەوە دوو کاژێر پێش بەرێ‌کەوتن سورای شەمەندەفەر کرێت. بۆ یەك فارگۆن، دەبێت چوارهەزارو چوارسەدو چل لیرە بدەین.. یانی تێکڕا دەبێت بیست و حەوت، بیست و هەشت هەزار لیرە بدەین..

(دەتوانرێت گفتوگۆی دیکەی وای لێ زیاد بکرێت کەپەژارەی خەڵکەکە دەرخات)

سیڤان لەکاتی گفتوگۆکەدا دەڕوانێتە دەفتەری یاداشتەکانی.. حامۆو شوانەکانی دی بەهۆی زیادکردنی کرێی شەمەندەفەرەوە، زۆر پەشێون...

حامۆ: بۆ شەش فارگۆن چەند شوانمان پێویستە؟

سیڤان: چوا پێنجێك بەسن.. من، ئەبوزەڕ، میرزا، سیلۆ، ئەژڤانە.

حامۆ: سیلۆ بۆچی؟ ئەو هیچ شارەزایی نییە..

سیلۆ: فێر دەبم..!

سیڤان: ئەبوزەڕ، بابم، من، میرزا... هێندە بەسین... بەڵام واچاکە سیلۆ یاخود ئەژڤانەش لەگەڵدا بێن..

میرزا: ئێمە چ سوودێکمان دەستگیر نابێت.. زەرەرمەندین.. ئەوەتا تامەڕەکان دەفرۆشین هەموو شت گران دەبێت.. بەو حاڵە چۆن دەژین..!

حامۆ: شوانێك بۆ دوو فارگۆن بەسە.. بەنۆرە سەرپەرشتی دەکەین.. زێترمان گەرەك نییە..

سیلۆ: منیش حەز دەکەم لەگەڵدا بێم، تایستا لەگەڵ مێگەلدا نەچووم... حەزدەکەم فێربم چۆن پیاو بەو ئەرکە هەڵدەستێت...

حامۆ: تۆ تەنها تا وێستگە لەگەڵمان دێیت. کاتێك مێگەلەکەمان سوارکرد، چەکەکانمان دێنیتەوەو دەگەڕێیتەوە ماڵەوە. بێ چەك ناکرێت بچینە (پەرڤەی) تەنها ئەبوزەڕو سیڤان‌و من‌و میرزا دەچینە ئەنقەرە.

سیڤان: ئەی بێریڤان؟

حامۆ بەنابەدڵی دێتە گۆ...

حامۆ: بەڵێ.. بەڵێ..بێریڤانیش. کەواتە پێنجین.

سیلۆ: منیش حەز دەکەم لەگەڵدا بێم، هێشتا ئەنقەرەم نەدیتووە.. لەلایەکەوە فێردەبم چۆن پیاو لەگەڵ مێگەل دەکەوێت، لەلایەکی دییەوە یارمەتی ئێوەش دەدەم..! لەگەڵ خۆتانم ببەن، بەتەنها ئەو هەموو مەڕەتان بۆ بەڕێوە ناچێت...!

حامۆ: تۆ لەگەڵدا نادێیت.. لێرە دەمێنییەوە..!

سیلۆ: دەی سا من کەی فێر ببم؟

حامۆ: لەوە گەڕێ.. لۆ لەگەڵدا نادێیت..!

سیلۆ: لەگەڵ خۆتانم ببەن.. تۆ پیریت، تۆ ئەستەمە لەنێو مەڕاندا هەڵتروشکێیت..! جگە لەوە یەکێکمان بۆ بێریڤان پێویستە.. خۆ ناکرێت بەتەنها لەنێو فارگۆنی نەفەراندا بەرهەڵدای کەین..!

حامۆ: گوتم تۆ لەگەڵدا نادێیت‌و بڕایەوە.. بەیانی لەگەڵ گزنگدا بەڕێ دەکەوین.. هەموو خۆ ئامادەکەن.. نابێت کاتمان بەفیڕۆ بدەین..

حامۆ بیر دەکاتەوەو خەمگینە..

حامۆ: ئەم سەفەرە بۆ ئێمە زۆر گرنگە.. ڕەنگە ژیان یا تێداچوونی ڤەیسیخانی بەم سەفەرەوە بەند بێت.. گەر زیانی تێدا بکەین، یا لەبرساندا یاخود لەبێ دەرەتانیدا دەفەوتێین.

حامۆ بۆ یەکەمین جارە وەك کەسێکی خاوەن سۆز دەردەکەوێت.. لەگەڵ




سیڤاندا ماوەیەك لێك دەڕوانن..

حامۆ: یا سوودێکمان دەستگیر دەبێت، یا تێدا دەچین، خودا بکات سەرەو خێر بێت..! وانییە سیڤان؟

سیڤان سەرێك دەلەقێنێت..

لەدەوارەکاندا پێویستییەکانی سەفەر ئامادە دەکرێن.. نان دەکرێت.. کیسە خواردن دەپێچرێێتەوە.. بێریڤان‌و ژنەکانی سیلۆو ئەبوزەڕ، بەهەست‌و سۆزی جوداوازەوە، بەڵام بەوێنەی لەگەڵ یەکدی گونجاودا، لەدەمەدەمی خۆرنشیندا نیشان‌دەدرێن.. ئامادەکردنی پێویستییەکانی سەفەر بەلەقتەی دۆکیومێنتی نیشان دەدرێن..

## 34– شەو؛ دەوارەکان

لەدەرەوەی دەوارەکاندا

ئەم لەقتانە شوێنەکە وەك گۆڕستانێك نیشان دەدەن

دەبێت بێریڤان‌و نەمامەکەی هەمیشە لەهۆشماندا بمێننەوە..

## 35– دەوارەکان؛ (سیڤان)

سیڤان‌و بێریڤان لەپێخەفێکدان.. سیڤان چاوەکانی لێکناوە.. بێریڤان لەروخساری دەڕوانێت.. سیڤان چاوەکانی هەڵدەبڕێت‌و نیگای لەگەڵ نیگای بێریڤاندا یەکانگیردەبێت.. بەبێ‌دەنگی‌و هەستێکی ئەڤیناوییەوە لێك دەڕوانن.. ماوەیەکی زۆرە ئەمە یەکەم جارە ئاوها بەسۆزو تامەزرۆییەوە لەیەك دەڕوانن.. سیڤان بەهێواشی‌و لەسەرەخۆیی دەست لەرووخساری بێریڤان دەخشێنێت.. بێریڤان دەستی دەگرێت‌و لەکۆڵی خۆی توند دەکات.. دەستی بەدڵێکی پڕ لەخۆشەویستییەوە ماچ دەکات‌و سەری دەخاتە سەر...

سیڤان: بێریڤان! ئاسکۆڵە ئازیزەکەم؛ دەچینە ئەنقەرە.. لەوێ چازانی چاکی لێ هەن.. چارەسەرت دەکەن.. چاك دەبییەوە.. ئای چەندەم خۆش دەوێیت..! تکا دەکەم، تەنها وشەیەکم پێ بڵێ.. هیچ نەبێت پێم بڵێ کەبڕوات پێمە.. یارمەتیم بدە..

چاوەکانی بێریڤان ئاویان تێ دەزێت.. لەباوەشی مێردەکەیدا چیچەڵە دەکات.. بەهەموو هێزێکییەوە لەئامێزی دەگرێت.. سیڤانیش توند باوەشی پێدا دەکات.. لەمێژە، ئەمە یەکەمین جارە ئاوها یەکدی لەئامێز بگرن‌و ئارەزووی تێکەڵ بوون بکەن..

ژنەکەی ئەبووزەڕ جارێکی دی خورجی مێردەکەی دەپشکنێتەوە.. یەك دوو سەلك پیازی دیکەی بۆ لەنێو دەنێت..

ئەبوزەڕ: دەچم ئەنقەرە دەبینم..

ژنەکەی جووتێك کەوشم بۆ دەکڕیت.

سیلۆ بەدزییەوە چوار قاپولکە لەخورجەکەی دەنێت.. وا پێدەچێت ژنەکەی نووستبێت.. پاش ئەوەی سیلۆ لەوە دڵنیا دەبێت کەژنەکەی نوستووە، پارەکانی دەردەهێنێت.. بەشادییەوە تێیان دەڕوانێت، بەوریاییەوە قەدیان دەکات. لەپشتێنەکەیدا توندیان دەکات.. ژنەکەی چاوی کردۆتەوەو سەرنجی دەدات.. پارەکە دەبینێت، نائارام دەبێت.. بەبەدگومانییەوە لەسیلۆ دەڕوانێت..

هەست دەكات كەشتێكی لەژێر سەردایە.. لەپڕ چاوەكانی سیلۆ لەگەڵ نیگاكانی ئەودا رووبەڕوو دەبنەوە.. سیلۆ ترسی لێ دەنیشێت، بەڵام دڵنیا نی‌یە لەوەی ئاخۆ ژنەكەی پارەكانی دیتوە یان نا..

ژنەكەی: ئەوە پارەی كێ‌یە؟

سیلۆ دەساكێت..

سیلۆ: باسی پارە لای كەس نەكەیت.. دەنا..

بەهەڕەشەوە بۆ ژنەكەی دەچێت..

سیلۆ: پارەی سیڤانە..

ژنەكەی: سیڤان ئەو هەموو پارەیەی لەكوێ بووە؟ مەڕی بەدزی‌یەوە فرۆشتووە؟

سیلۆ: كارم پێوە نی‌یە لەكوێی بووە..! داویە بەمن بۆی وەشارم.. دەخڵت بەسەرەوە نەبێت...

ژنەكەی بێ دەنگ دەبێت.. سیلۆ خۆی لێ نزیك دەكاتەوە..

سیلۆ: سیڤان بار دەكات.. پارەی ئەوە.. لەلای كەس باسی نەكەیت.. تێگەیشتیت..؟ بار دەكات.. پاشانیش ئێمە دەباتە كن خۆی..

ژنەكەی: بەراستتە؟ بیرم لەشتی خەراپ دەكردەوە...!

سیلۆ: بۆ؟

ژنەكەی: پێم وابوو لێم وەڕست بوویت.. لێم بێ‌تاقەت بوویت‌و دەتەوێت جێم بهێڵیت...

سیلۆ : تێك‌چوویت؟ چۆن دەتوانم كاری ئاوها بكەم؟

بۆ كەڵەك‌بازی لەباوەشیدا چیچەڵە دەكات‌و هەوڵ دەدات میهرەبانی‌ی نیشان بدات...

حامۆ لەسەر پشت لێی كەوتووەو چاوی لەكونجێك بڕیوە.. نیگەرانی خۆی لەمەڕ بێریڤان دەردەبڕێت.. وڕێنە ئاسایی بیر دەكاتەوەو قسان دەكات..

* حامۆ: كەواتە گەر بێریڤانت لەگەڵ نەبێت تۆش نادێیت؟ رێگەیەكی دوورمان لەبەرە، بەدبەختی یەخەگیرمان دەبێت.. خودایە بەخێری بگێڕیت..

## 36- دەوارەكان لەتاریك‌و روونی بەربەیاندا

تاریك‌و روونە.. بێریڤان بۆ دواجار نەمامەكەی ئاو دەدێرێت.. ئاو بەكەوەكانی دەدات.. مێگەلەكە بەرێ دەخرێت.. بێریڤان كەوەكان بەژنەكەی سیلۆ دەسپێرێت.. نێوانی سیلۆو ژنەكەی ئاڵۆزە، چونكە ژنەكەی ترسی ئەوەی هەیە بەجێی بهێڵێت.. ژنەكان ئاو بەدووی پیاوەكاندا هەڵدەدەن.. ژنەكەی سیلۆ بەچمكێكی شەدەكەی فرمێسكەكانی دەسڕێت..

## 37- مێگەلەكە بەرێگەوە

مێگەلەكە لەو بوومەلێڵی دەم بەیانەدا كێوو دۆڵەكان دەبڕێت.. دەنگ‌و فیكەی تێخوڕینی ئاژەڵەكان دێت.. بێریڤان‌و حامۆ بەسواری هێسترەوەن.. ئەوانی دی پیادەن.. هاڕەی رێبڕینی مێگەلەكەو هاواری شوانەكان تێكەڵ بوون.. بۆ یەكەم جار لەرووخساری بێریڤاندا، نیشانەو هێمای شادی‌و ئارەزووی ژیان بەدی دەكرێت..

حامۆ بەچارەی خەمبارو بۆرخزیەوە، دەڕوانێتە ئەو زەوی‌یەی تراكتۆرێك خەریكە وەردی دەداتەوە.. لەنێزیكەوە تراكتۆرەكە دەبینین چۆن زەوی شەقار شەقار دەكات‌و هەڵی دەگێڕێتەوە..

وەرددانەوەی زەوی‌یەكە لەلەقتەیەكی نێزیكدا...

گۆڕانكاری‌یەكە هەست پێ دەكرێت..

## 38- شار

كاتێك مێگەلەكە بەنێوشاردا بەرەو وێستگە دەئاژوون، حالیلانی‌یەكان لەگۆشەی شەقامێكدا چاوەڕوان دەكەن...

حامۆ رەپ لەجێی خۆی رادەوەستێت.. بەبەدگومانی‌یەوە لەدەوروبەری خۆی دەڕوانێت.. بێریڤان لەپشتی حامۆوە دەوەستێت.. حامۆ هەست دەكات كەبێریڤان لایەنی ئەو دەگرێت.. لەكاتێكدا سیڤان بەدەم فیكەوە مێگەلەكە دەئاژوێت، بەتیلەی چاو چاودێری حالیلانی‌یان دەكات.. هەروەها ئەبوزەڕو میرزاو سیلۆش...

ئەودەمەی سیلۆ ئەوانی دی بەبەدگومانی‌یەوە دەڕوانن، لەپڕ تەقە هەڵدەستێت! بەهۆی تەقەكانەوە مەڕەكان پەرش‌و بڵاودەبنەوە..

حامۆ لەهێسترەكەی دادەبەزێت‌و خۆی دەچەمێنێتەوە، چونكە نازانێت تەقەكان لەكوێوە دێن.. پەلاماری دەمانچەكەی دەدات، بێ ئەوەی بیخاتە سەرپێ، بەرەو پێش رادەكات.. بەڵام دەبینێت حالیلانی‌یەكانیش حەپەساون.. تێدەگات مەسەلە پەیوەندی‌ی بەوانەوە نی‌یە..

ئەوبارە حالیلانی‌و ڤەیسی‌خانی لێك نێزیك دەكاتەوە، هەرچەندە بۆ ماوەیەكی كورتیشە.. شوانەكان هەوڵ دەدەن مەڕەكان كۆكەنەوە.. لەو دەمەدا پەزەكان لەژیانی خۆیان گرنگترن.. حالیلانی‌یەكانیش بەدووی مەڕەكاندا رادەكەن تاكۆیان بكەنەوە..

سیلۆ خورجەكەی بەبێریڤان دەسپێرێت كەلەوكاتەدا لەسواری هێسترەكە دابەزیوە... بێریڤان هەست بەقورسی خورجەكە دەكات، تێی دەڕوانێت، قاپولكەكان دەبینێت.. هیچ سەریان لێ دەرناكات.. مەڕەكان بەبەر دوكانەكاندا رادەكەن‌و سندوقەكان دادەڕمێنن.. ژاندارم بەوێدا رادەكەن...

ئێستا تەقەكەرەكان دەناسرێن.. حالیلانی‌و ڤەیسی‌خانی بوونەتە تەماشاچی... بەڵام شوانەكان، بەتایبەت سیڤان‌و نێچیرەڤان، لەگەرمەی ئەو تەقانەدا بەملاو بەولادا رادەكەن‌و مەڕەكان كۆدەكەنەوە.. ژنێك بەتێڵایەكەوە پەلاماری پیاوێكی چەكدار دەدات.. پیاوەكە بەدەمانچەی دەستی‌یەوە، هەوڵ دەدات لەدەستی هەڵبێت‌و خۆیی لێ لێ رزگار كات..رووی دەمانچەكەیی تێ ناكات.. دەوەستێت‌و هەوڵ دەدات دووری خاتەوە..

پیاوێك دەپێكرێت..

مەڕەكان بەخێرایی بەملاو ئەولادا هەڵدێن.. مێگەلەكە ئاڵۆزاو لێك‌ترازاوە.. ئەم لەقتەیە نیشانەی ئەوەیە كەلەئاستی هێزی پەرش‌و بڵاوو لێك‌دابڕاودا با مەڕیش بێت هیچ ناكرێت...

لەقتەیەكی نێزیك.. وێنەی تاكە تاكە.. زۆر بەخێرایی.. هاوار قیژە.. میرزا كەلەهەڵپەی كۆكردنەوەی مەڕەكاندا بوو، بەگوللەیەك دەپێكرێت... بەلادا دێت.. هەوڵی هەستاندنەوە دەدات..ناتوانێت.

بێریڤان بۆ یەكەم جار هاوارێكی لێ بەرز دەبێتەوە.. سیڤان تێی دەڕوانێت‌و رادەكات بۆلای.. ئەبوزەڕ پەركەم دەیگرێت.. دەكەوێت‌و رەپ دەبێت.. مەڕە ئاڵۆزاوەكان هەنگاوی بەسەردا هەڵدێنن..

چەند مەڕێك بەرگوللە كەوتوون. سیڤان خورجەكەی سیلۆ لەبێریڤان وەردەگرێت.. توند دەستی بێریڤان دەگرێتو هەوڵ دەدات بیباتە پەسارێكی ئامانەوە... مەڕەكان بەراستو چەپدا پێكدا دێنو لەئالۆزترین باردان...

قورسیی خورجەكە سەرنجی سیڤانیش رادەكێشێت ئەویش تێی دەڕوانێت.. قاپولكەكان دەبینێت.. بەڵام هیچ سەریان لێ دەرناكات...

تەقە تەواو دەبێت.. خامۆشی پاش گێژەڵووكە باڵ دەكێشێت.. دوو كوژراوو چەند بریندارێك لەسەر شەقامەكە كەوتوونو خوێنیان لەبەر دەڕوات... كوژراوەكان بەرۆژنامە دادەپۆشن.. بۆ ئەوەی با رۆژنامەكان رانەدات.. بەبەرد قایم دەكرێن...

سیمای ژنی كۆستكەوتوو، پیاوان، منداڵان لەدەوروبەری كوژراوەكان نیشان دەدرێن... بەرپرسیارانو كاربەدەستانی رژێم وەكو فیلمەكانی (Yasilcam)[6] دا بەو نێوەدا رادەكەن.. لەراستیدا هەموو شت بەسەرچووەو هیچ هۆیەكی ئەو راكەراكەیە نییە، بەڵام بەهەرحاڵ

حامۆ لەگەڵ مەڕەكاندا خەریكە..

ئەبوزەڕ وردەوردە دێتەوە سەرخۆی...

ئەودەمەی سیڤانو شوانەكەی دی لەگەڵ نێچیرەڤانو براكانیدا خەریكی كۆكردنەوەی مەڕەكانن، بێریڤان سەرنجیان دەداتو ئەسرین دەڕێژێت.

دوكتۆری بەیتاڵ سەیری مەڕەكان دەكات.. چەند سەرێك، بەبیانووی ئەوە گوایە نەخۆشن، لەمێگەلەكە بڕ دەدات. ئەوجا گەواهی نامەكەیان بۆ ئیمزا دەكات، كەمەڕەكان بەرگەی گواستنەوە دەگرن. پاشان بەفیزێكەوە بەرتیلەكەی وەردەگرێت، هەم مەڕو هەم پارە...

سیڤان بەوردی سەرنجی بەیتاڵەكە دەدات.. (بیر لەو دوكتۆرە دەكاتەوە كەخەریك بوو بێریڤان فەحس بكات)..

لەو دەرفەتەدا سیڤانو سیلۆ دەتوانن دەربارەی قاپولكەكان بدوێن...

سیڤان: ئەو شتە وێنە لەسەر كێشراوانە چین؟

سیلۆ: بەوانە لوقمو كشمیشم لەچەرچییەكە كڕی، بەڵكە ئێستاش شتێكیان پێ وەرگرم..

(ئایا دەشێت لەلەقتە جۆربەجۆرەكانی ئەم فیلمەدا، واقیعو سوریالی، ئێستاو پاشەڕۆژ، رابووردو داهاتوو پێكڕا هەمان كات نیشان بدرێن؟)

حامۆ ئەودەمەی یارمەتی میرزا دەدات بۆ سەرخستنییە نێو عارەبانەیەكی تریشقەوە، بەچاو بەدووی سیلۆدا وێڵە...

حامۆ: چارەی دیكەمان نییە، دەبێت لەجێگەی میرزا سیلۆ لەگەڵدا بێت، یەكێكی دی باشتر بوو، بەڵام ئۆف.. ئۆف.. دەبێت بەرگەی ئەم هەموو مەینەتییە بگرین..

بەدەوروبەری خۆیدا دەڕوانێتو هاوار دەكات..

حامۆ: سیلۆ.. سیلۆ..

سیلۆ بەدووی مەڕەكاندا رادەكاتو یەكەیەكە بەنێوی خۆیانەوە بانگیان دەكات...

### 39- وێستگە

دووسێ هەرزەكار بەبەرماڵی بەڕێوەبەری وێستگەدا پیاسە دەكەن، لەگەڵ كیژەكانی بەڕێوەبەردا خەریكی سەرەتاتكێو خەندە گۆڕینەوەن.. كیژەكان لەپەنجەرەكەوە نیگایان دەكەن...

ئەمە پێوەندییەكی ئەڤیندارییە كەبەنیگایەكی قەدەغەكراوو خەندەكی شیرین دابین دەكرێت، وەكو لەشارۆچكەكاندا باوە..

بەڕێوەبەری وێستگە، هەرزەكارەكان بەدی دەكاتو دێتە بەردەرگە..

بەڕێوەبەر: جارێكی دیكە لەم نێوەدا بتانبینمەوە ئێسكتان دەهاڕم... واپێتان دەڵێم، ئێسكتان بەجۆرێك دەشكێنم كەدوكتۆر نەبێت پێكەوەیان بلكێنێتەوە! لەبیرتان نەچێت.. ها!

یەكێك لەهەرزەكارەكان: بابەڵێ، هیچ نیازێكی خراپمان نییە..! تەنها بێرەدا تێپەڕبووین.. ئایا گوزەر كردن بەم نێوەدا یاساغە؟؟

بەڕێوەبەر: ئێرە نەڕێگەیەو نەشەقام.. بەدووی چ وێڵن..؟ ئاگادارتان دەكەمەو ئەمجارە دەبینن چتان لێ دەكەم.. پێتان وایە من گەوجم..؟

لەو دەمكاتەدا مێگەلەكە دەگاتە بەردەرگەی وێستگە..

دوكتۆری بەیتاڵ: ئەم دوانەیان نەخۆشن..

سیڤان بەپسوڵەی دوكتۆرەوە دەچێتە لای بەڕێوەبەر.. بەڕێوەبەر لەبەرخۆوە بەتوڕەیییەوە ورتەی دێت..

(دەبێت گوتەكانی لەكاتی فیلمگرتندا دیاری بكرێن)

سیڤان دەنێرێتە لای بەرپرسیاری مەخزەن..

بەڕێوەبەر: ئەو شەلاتییانە..!

سیڤان: دوكتۆری بەیتاڵ ناردوومی.

بەڕێوەبەر: پێنجسەدو پەنجا سەر.. چاكە.. دوو مەڕ لەبەر ماڵەوەدا جێ بهێڵنو ئەمەبەرە بۆ بەرپرسیاری مەخزەن..

بەرپرسیاری مەخزەن لەگەڵ سیڤان دەدوێت..

(دەبێت ئەم گفتوگۆیەش لەكاتی فیلمگرتندا دیاری بكرێت)

بەرپرسیاری مەخزەن: پسووڵەكە تەواوە.. جارێ دەبێت مەڕەكان كێشانەكەین.. دیاریەكەی خۆمم لەسووچێكدا بۆ ببەستەوە..!

بێریڤان لەگۆشەیەكدا چاوەڕوان دەكات.. لەدوورەوە دایكیو خوشكەكەییو براكانی بەدی دەكات.. دەهەژێت.. ئەوانیش لەدوورەوە لەم دەڕوانن.. حامۆ كەدەیانبینێت، گرژ دەبێت..

حامۆ: ئەوانە چییان گەرەكە..؟ چ كەتنێكیان لەژێر سەردایە...؟

ئەبوزەڕ: گەر ئارەزوو دەكەیت، هەموویانت وا بۆ هەڵبرم كەچیدی بەم نێوەدا نەیەنەوە..!

لەكاتی باركردنی مەڕەكاندا، پێوەندیی دووربەدووری بێریڤانو كەسو كارەكەی نیشان دەدرێت.. لێرە بەرتیلو قۆڵبڕی، لەوێش هەستێكی گەرمو پڕ سۆز لەنێوان مرۆڤا.. دایكی بێریڤان بەبینینی كچەكەی ئەسرین دەڕێژێت.. بێریڤانیش دەهاژێتو چاوەكانی فرمێسكیان تێدەزێت..

(دەشێت لێرەدا کەسێك بکەوێتە نێوانەوە، تا پێك گەیشتنی دایك و کچەکەی بسازێنێت. دەتوانرێت ئەو رۆڵە بەباسری پارێزەرو رۆژنامەنووس بدرێت).

باسری لەحامۆ نێزیك دەکەوێتەوە..

حامۆ لەگەڵ مێگەلەکە خەریکە..

باسری: گەر رێگە بدەن حەز دەکەم کەمێك قسە بکەین..

حامۆ : دەزانم دەتەوێت چ بڵێیت..!

باسری: هەق وایە کەمێك دڵفراوان بن.. بێریڤان ناساغە.. وائێستا دەڕوات‌و رەنگە چیدی نەگەڕێتەوە.. ئەمە بۆ دڵی دایکی زۆر ئەستەمە.. زۆر نا.. تەنها پێنج دەقیقە..

حامۆ: نەپێنج دەقیقەو نەچرکەیەك...!

بەتوڕەیی‌یەوە دەڕوات..

راڤنێ کەچاوی بەو حاڵە دەکەوێت دەست دەداتە دەمانچەکەی.. خەڵکی دەوروبەر رێگەنادەن..

بارەکە ئاڵۆزتر دەبێت..

کاتێك سیڤان بەپسووڵەو کاغەزەکانی دەستی‌یەوە لەمەخزەن دێتە دەرەوە، تامەزرۆیی‌و خەمباری‌ی بێریڤان‌و کەس‌و کارەکەی دەبینێت..

بەرپرسیاری مەخزەن بەبەڕێوەبەری وێستگە دەگات..

سیڤان سەرقاڵی حاڵ‌و باری بێریڤان‌و خانەوادەکەیەتی‌و ناپەرژێتە سەر قسەکانی ئەوان...

بەرپرسیاری مەخزەن: ئەو فارگۆنەم بۆ مێگەلەکە تەرخان کردووە، بەڵام لەو فارگۆنەدا جاری پێشوو (D.D.T) بارکرابوو، ئایا بۆ پەزەکان زیانی نابێت..؟

بەڕێوەبەر پێی وایە چاك دەمی چەور نەکراوە، بۆیە بەلایەوە گرنگ نی‌یە.. کەمێك توڕەیە.. جارجارە خەندەیەکی تاڵی بۆ دەکات...

بەڕێوەبەر: زیانی چی؟ جگە لەوەی ئەوە لەمێژە.. خۆ پەزەکان مێشوولە نین..! ئەوانە مەڕی دابەستەن.. ئەوان لەبەریان گرانە دوو مەڕ لاخەن.. دەبێت (D.D.T) چ زیانێکی بۆ پەز هەبێت؟ ماوەیەکی زۆریشی بەسەردا تێپەڕیوە.. خۆ مێشوولە نین..؟

لام سەرلایی سەیرێکی کاغەزەکان دەکات‌و ئیمزایان دەکات.. هێشتا هۆشی لای ئەو هەرزەکارانەیە کەدەورو خولی کیژەکانیان داوە..

روو لەبەرپرسیاری مەخزەن دەکات..

بەڕێوەبەر: دەبێت ئەو شەلاتی‌یانە تەمبێ بکرێت.. ئەوانە منداڵی کێن؟ داك‌و بابیان نی‌یە؟

سیلۆش سەرنجی هەڵس‌وکەوتی



هەرزەکارەکان و کیژەکان دەدات.. هەستی هەرزەکارانەی دەهەژێت...

هەندەك کەسی دیکە دەیانەوێت بکەونە بەینەوە تا پێکگەیشتنی بێریڤان‌و دایکی بسازێنن.. ژەندەمەیەك دێت بۆ لای حامۆ..

ژەندرمە: حامۆغا..

حامۆ ناهێڵێت ئەویش بێتە گۆ..

حامۆ: پێشەکی پێت دەڵێم، گەر تۆش بەنیازی پێکگەیشتنی حالیلانی‌یان‌و ئەوشتانە بکەیت، ئەوا لێگەڕێ...!

ژەندرمە: ئاخر پیاو چۆن هێندە کەللەڕەق دەبێت، حامۆغا..؟

حامۆ: کەللەڕەقی بێت یان نا.. کەس بۆی نی‌یە لەگەڵ کەسدا قسان بکات! گەر هێندە تامەزرۆی ئەون، دەتوانن هەر ئێستا لەگەڵ خۆیان بیبەنەوەو بڕایەوە...

شەمەندەفەرەکە دەکەوێتەرێ..

نێچیرەڤان لەگەڵ کەوتنە رێی شەمەندەفەرەکەدا رادەکات‌و بانگی بێریڤان دەکات..

نێچیرەڤان: بێریڤان؛ خوشکەلێ.. هیچمان پێ ناکرێت.. بمانبەخشە! نامانەوێت حاڵەکە خراپتر کەین.. بەهیواین بەسلامەتی لەئەنقەرە بگەڕێیەوە.. رەنگ هەیە کاتێك مرۆ دەڕوات چیدی نەگەڕێتەوە، یاکەگەڕایەوە چاوی بەکەسێك نەکەوێتەوە.. خوشکەلێ بمانبەخشە.. گەردنی حالیلانی‌یان ئازادکە.. ئێمە خەراپەمان دەرهەق کردیت..

بێریڤان گوێ رادەهێڵێت، بێ ئەوەی سەر لەپەنجەرەکەوە بەرێتە دەر.. حامۆ لەپڕ هەڵدەستێت‌و پەردەی پەنجەرەکە دادەکێشێت..

نێچیرەڤان هەر هاوار دەکات..

نێچیرەڤان: بێریڤان؛ خوشکەلێ.. وەرە بەرنەدەیت.. چاك دەبیەوە.. بێریڤان لەیادمان مەکە.. خوشکەلێ..

چاوەکانی نێچیرەڤان ئاویان تێزاوە، دەگری... دایکی بێریڤانیش دەگری.. ئەوانی دیکەش فرمێسك لەچاوانیاندا قەتیس‌ماوە...

**40- شەمەندەفەرەکە بەمەڵبەندێکدا تێدەپەڕێت کە نموونەیە بۆ سروشتی نێوچەکە**

سێ لەقتەی جوداواز...

لەقتەیەکی گەورە لەبەرزایی‌یەوە بۆ خوارەوە

لەقتەیەکی نوێی شەمەندەفەرەکە

شەمەندەفەرەکە لەپێچێکەوە دێت

### 41- شەمەندەفەرەکە

لێخوڕی شەمەندەفەرەکە

لەقتەیەکی ڕێگە ئاسنینەکەو دەوروبەرەکەی لەروانگەی لێخوڕی شەمەندەفەرەکەوە لێخوڕەکە بەدەنگی بەرز دەدوێت

یەکەم لێخوڕ: ئەم کۆچەرانە زۆر دەستڕژدن، هیچ شەرم ناکەن، تاقە مەڕێکیان داوە بەهەر هەموومان.. هەی بێ ویژدانینە، ئاخر تاقە مەڕێك بەشی چی دەکات؟ لەتاقەمەڕێك چمان پێ دەبڕێت؟

دووهەم لێخوڕ: وەرە بادەردێکیان بدەینێ کەقەت لەیادی نەکەن‌و لەمەودوا بەشی لێخوڕی شەمەندەفەر زێتر کەن..! دەڵێیت چی؟

لێخوڕی یەکەم لەمەبەستی دەگات.. یەکسەر وەستێنەرەکە رادەکێشن، مەڕەکان لەگەڵ وێستەکەدا بەسەر یەکدا دەگلێن...

سێ جار بەو شێوازە وێست دەکەن.. نەفەرەکانیش بەسەریەکدا دەترشێن..

سیڤان تێدەگات مەبەستیان چی‌یە..

سیڤان: هەی کوونینە..! هەی خوێرینە..!

حامۆش تێدەگات..

حامۆ: هەی کافری خودانەناسینە.. ئەوە بەئەنقەست ئاوها دەکەن..! بەرتیلەکەمان کەم بووە.. بەشی نەکردوون.. ئێسك‌و پروسکی پەزەکانمان تێك دەشکێنن..!

نەفەرەکان دەشڵەژێن..

بێریڤان لەجێگەی خۆی بەردەبێتەوە..

حامۆش لەجێگەی خۆی دەپەڕێت..

لێخوڕەکان لەقاقا دەدەن

یەکەمیان: دەبێت بەلانی کەمەوە قاچی پێنج مەڕیان شکابێت..

دووهەمیان: قیروسیا... پیاو دەبێت دەرسی ئەم جۆرە کەسانە دابدات تا عاقڵ بن..! بێ چەندو چوون بەشی دوکتۆری بەیتاڵ دەدەن!

یەکەمیان: بەشی بەرێوەبەریش..!

دووهەمیان: بەڵام کەدێتە سەر لێخوڕ، دەستیان تێ ناچێت..! دەبخۆن دەی..!

وێستێکی دیکەشی بۆ دەکەن..

هەردووکیان لەقاقا دەدەن...

لەقتەی کورت‌و کاریگەری شەمەندەفەرەکە لەپێشی‌یەوە تادواوە خێراو یەك لەدووی یەك..

ئەو پەزانەی قاچیان شکاوە دەبائێنن.. لەو لەقتانەدا شەش فارگۆنەکەی ئەبوزەرو سیلۆو سیڤان دەدیتین.. سیڤان بەردەوام فرکەی دێت..

### 42- وێستگەیەك




شەمەندەفەرەکە لەوێستگەیەك رادەوەستێت..

هەندەك دادەبەزن‌و هەندەك سوار دەبن..

حامۆ لەپەنا ئەو فارگۆنانەدا وەستاوە کەپەزەکانیان تێدایە..

سیڤان: بابە حاڵیان خراپە...! لێخوڕەکان دەردمان دەدەنێ.. شەش مەڕ قاچیان شکاوەو چەند دانەیەکیش پەراسوویان..

حامۆ: خودا ئاگادارە بەئارەزوو ئاوها دەکەن..!

سیڤان: ئاشکرایە بەئارەزوو ئاوها دەکەن..! بەدڵی خۆیان مەڕیان پێ نەدراوە..!

حامۆ: ئەوانە مرۆ نین! خەڵکی بوونەتە جەردە..! جاران پێمان وابوو کەچەتە هەر لەکێوان هەن.. ئێستاکە داکشاونە دۆڵەکانیشەوە...!

سیڤان: بابە؛ ئەمانە گیرفان بڕن! بادوو مەڕی دیکەیان لەقاچ‌شکاوەکان بدەینێ.. خۆ هیچ نەبێت چیدی ئەو سەگبابی‌یە ناکەن..

حامۆ: یانی بەچۆکدا بێین؟ ئەی پاشان؟

سیڤان: چارەی دیکەمان هەیە؟ رێگەم بدە من لەگەڵیان بدوێم... پێیان دەڵێم ئێمەش هەژارین‌و پێمان هەڵناسوورێت.. گەر پێویست بکات لەبەریشیان دەپاڕێمەوە..! دەنا ئەو گیرفان‌بڕانە قاچی گشت مەڕەکان دەشکێنن!

حامۆ بەنابەدڵی‌و ناچاری سەری رەزامەندی بۆ دەلەقێنێت...

سیڤان بەرەو لای لێخوڕەکان رادەکات..

ئەوان لەوکاتەدا ئاو دەهێنن ...

لەدوورەوە دیارن گفتوگۆ دەکەن..

بەدەست راوەشاندنیاندا دەردەکەوێت کەرێك دەکەون..

لێخوڕەکان پێدەکەنن.. یەکێکیان دەست بەشانی سیڤاندا دەدات..

شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات، دووکەڵی بەرزدەبێتەوەو دەکەوێتە رێ..

### 43- فارگۆنەکەی سیڤان

لەقتەیەکی ئەو فارگۆنەی پێشان (D.D.T) تێدا بووە.. یەکێك لەمەڕەکان دیواری فارگۆنەکە دەلێسێتەوە.. نابێت ئەم لەقتەیە زۆر بخایەنێت، بەڵام دەبێت مەوداکەی هێندە ببێت کەگومانێك لەخەیاڵی بینەردا بڕسکێنێت.. لەلەقتەکانی پاشتردا، چەند مەڕێك دیوارەکان دەلێسنەوە...

### 44- ئەو فارگۆنە نەفەربەرەی حامۆو بێریڤانی تێدان

لەفارگۆنەکەی حامۆو بێریڤاندا، جوتکارێك چیرۆك دەگێڕێتەوە..

(ئەم چیرۆکە لەسەر کاسێت تۆمار کراوە، یا ئەم چیرۆکە لێ دەدەین، یاخود چیرۆك بێژێك پەیدا دەکەین تا چیرۆکمان بۆ بگێڕێتەوە. ئەم چیرۆکەو گۆرانی‌یەکان لەهەژاندنی پەردەکانی دیکەدا کاریگەرییان دەبێت لەلایەکەوە رووداوی راستەقینەو لەلایەکی دی‌یەوە چیرۆکگێڕاندنەوەیە).

پاشان چیرۆك بێژ تێ هەڵدەکات‌و گۆرانی‌یەك دەچرێنێت..

### 45- شەمەندەفەرەکە بەتونێلێکدا تێدەپەڕێت

شووتێکی هێندە توند لێ دەدات کەبینەران راچڵەکێنێت...
شەمەندەفەرەکە خۆی بەتونێلێکدا دەکات...

(شەمەندەفەرەکە هەمیشە لەمەڵبەندی چۆڵەوانیدا نیشان دەدرێت. پێموایە تێکرا دە لەقتەی (گەورە) بەس بن).

### 46- شەمەندەفەرەکە

کاتێك شەمەندەفەرەکە بەتونێلەکەدا تێدەپەڕێت، وێنەی نێوەوە نیشان دەدرێت. لەقتەیەکی پەنجەرە تاریکەکان.. پەزەکان لەفارگۆنە جوداوازەکاندا...

### 47- ئوتومبێلێکی (مورات) بەدووی شەمەندەفەرەکە کەوتووە..

شەمەندەفەرەکە لەجامی ئوتومبێلەکەوە دەبینین.. لەچاوی یەکێك لەنەفەرەکانی ئوتومبێلەکەوە دەڕوانینە ئەو فارگۆنانەی پەزەکانیان تێدایە.

بوومەلێڵەی ئێوارەیە..

ئوتومبێلەکە شەمەندەفەرەکە پێش دەدات..

### 48- وێستگەیەك

ئوتومبێلەکە دەگاتە وێستگەکە.. دوو پیاو دادەبەزن و بێ ئەوەی هیچ سەرنج رابکێشن، چاوەڕوانی شەمەندەفەرەکە دەکەن..

لەم وێستگەیەدا کوێرێك بلوێر دەژەنێت.. کیژۆڵەیەکی چکۆڵە چاوساغێتیو چمکێکی چاکەتەکەیی گرتووەو بەکێشی دەکات..

شەمەندەفەرەکە دەگاتە وێستگەکە.. دوو پیاوەکە دەخوازن بزانن پەزەکان لەکام فارگۆنەدان...

تاریکی کردووە.. چراکان هەڵکراون..

خەڵکی ئاو بەکێش دەکەن.. تفاق دەکڕن..

ئەی ڤەیسی خانییەکان؟

حامۆ ئەو فارگۆنانە دەپشکنێت کەپەزەکانیان تێدان...

سیڤان: بابە، چەند مەڕێك نەخۆش کەوتوون.. تێناگەم بۆ.. نازانم چ رووی داوە..

حامۆ: گشت سەفەرێك سەرەتا ئەوەیان لێ روودەدات.. بەستەزمانانە گێژدەبن.. چاك دەبنەوە...!

شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات..

لەوکاتەدا یەکێك لەدزەکان خۆی دەگەیەنێتە فارگۆنێك لەوانەی کەشوانی تێدا نییە (ئەوە ئەو فارگۆنەیە کە ئەبوزەڕ پاسی دەکات) بەشیشێك دەرگاکەی دەکاتەوە.. دزەکە کێردێکی گەورەی قەسابیی لەبەر پشتێنەکەدایە، (یا لەگیرفانیدایە).. سەر دەکەوێت و دەرگەکە لەپشت خۆیەوە دادەخات، ئەوەی دیکەیان دەگەڕێتەوە بۆ لای ئوتومبێلەکەو دوای شەمەندەفەرەکە دەکەوێت.

### 49- شەو، ئەو فارگۆنەی ئەبوزەڕ پاسی دەکات

ئەبوزەڕ لەنێو پەزەکاندا رۆنیشتوەو گۆرانی دەچڕێنێت.. هەمان کات دەنگی شەمەندەفەرەکەو باعەی مەڕەکان دەبیسترێن..

ئەبوزەڕ بێدەنگ دەبێت.. گوێ هەڵدەخات.. باعەی مەڕەکان هەر بەردەوامە..

ئەبوزەڕ: سیلۆ... سیلۆ...

سیلۆ گوێ هەڵدەخات.. هاواری ئەبوزەڕ دەبیستێت..

سیلۆ: چ بووە؟ .. بۆ دەقیژێنیت؟

ئەبوزەڕ: سیلۆ..!

سیلۆ: گوێم لێتە، بڵێ چ بووە..؟

ئەبوزەڕ: مەڕەکانی لای تۆ باعەیان دێت ، بۆچی؟ هیچ رووی‌داوە..؟

سەیرێکیان بکە..

سیلۆ بانگ لەسیڤان دەکات..

سیلۆ: سیڤان... کاکە سیڤان!

باعەی مەڕەکان..

سیڤان بەپێچەوانەی ئەوانی دیکەوە، لەجێگەیەك دانیشتووە وەك کابینە وایە.. گوێ بۆ دەنگە دەنگەکە هەڵدەخات.. چاوی لێیە وا ئوتومبیلێك زۆر نێزیك شان بەشانی شەمەندەفەرەکە رێدەکات.. سیڤان لاییتێکی دەستی پێدەکات ... بەڵام هیچ بەدی‌ناکات.. دەچێتە سەربانی فارگۆنەکە.. کاتێك لەفارگۆنێکەوە بۆ یەکێکی دی باز دەدات، دەبینێت لەفارگۆنی دوای دواوە شتێك فڕێ دەدرێتە خوارەوە.. باوەڕ بەچاوی خۆی ناکات..

سیڤان: ئەبوزەڕ، هێی ئەبوزەڕ، کوێریت هەی گوێرەکە! دز وا لەفارگۆنەکەی تۆدایە.. کوێریت..؟

لەو دەمەدا دەگاتە سەر ئەو فارگۆنەی دزەکەی تێدایە.. دزەکە خۆی هەڵدەداتە خوارەوە، شونکە شەمەندەفەرەکە بەهێواشی بەرەو سەرەوژوورکەیەك رێ‌دەکات. سیڤان بەئەستەم خۆی بۆنێو فارگۆنەکە شۆڕدەکاتەوە.. پەزەکان باعەو بارەیان لێ هەڵستاوە.. سیڤان لایتەکەی لەمەڕەکان دەدات، دەبینێت سەری دە پازدەیەکیان بڕدراون.. بارەیان دێت و لنگەفرتێ دەکەن...

### 50- شەو؛ وێستگەیەك

حامۆ تووڕەیەو بێ دەستەڵاتە... زللەیەکی مزر لەپەناگوێی ئەبوزەڕ دەدات.. سیلۆو سیڤان حەپەساون.. چەند کەسێکیان لەدەور گردبۆتەوە...

حامۆ: دز گەردنی مەڕەکان دەبڕن و ئێوە هەستی پێناکەن! چۆن شوانێکن؟ ئەو هەتیوچانە دەیانتوانی دەرپێکانتان لەلنگ داماڵن و هەست بەخۆتان نەکەن..! خودا گەڕتان کات..! کەڵکی ئەوەتان نییە سەرەزووتکێکتان پێ بسپێردرێت، ئەوە باسی مەڕ هەر مەکە..!

چەند مستێکی دی لەئەبوزەڕ دەسرەوێنێت...

حامۆ: چ لەمەڕی بێ سەر بکەین؟ چۆن متمانە بەشوانێك دەکرێت کەگەردنی مەڕەکانی پێ نەپارێزرێت؟ پیاوێك گەردنی مەڕەکانی پێ نەپارێزدرێت چۆن دەتوانێت ژنی خۆی بپارێزێت؟

ئەوکاتەی شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات، حامۆ دەچێتەوە گیانی ئەبوزەڕ.. یەك دوو شەپی دیکەشی تێ دەسرەوێنێت.. خەڵکی بەزەحمەت لەچنگی دەربازدەکەن..

باعەی مەڕەکانی ئەو فارگۆنە دێت کە (D.D.T) تێدابووە.. حامۆ دەچێتە نێوەوە...

حامۆ: بچۆ بۆ لای بێریڤان.. بۆ لای ژنە پیرو قدوم رەشەکەت..!

سیڤان: بابە لێرە دەمێنم...

حامۆ: گوتم بڕۆ...! کۆشی ئەو شوومە هەر قابیلی خۆتە.. بڕۆ! پاڵێك بەسیڤانەوە دەنێت..

سیڤان بەناچاری دوور دەکەوێتەوە...

شەمەندەفەرەکە خەریکە دەکەوێتە رێ.. سیڤان رادەکات و لە فارگۆنی نەفەرکان سوار دەبێت...

### 51- شەمەندەفەرەکە بەشەو رێدەکات

حامۆ سەرنجی مەڕەکان دەدات.. لەهۆی نەخۆشییەکەیان تێناگات.. سەرەتا هەوڵ دەدات بەبلوێرژەندن هێوریان کاتەوە.. پاشان گوێی هەندێکیان دەقلیشێنێت و خوێنەکەیان دەتەکێنێت.. دواتر لەشووشە ئاوێک دەنەوێت و هەوڵ دەدات ئاویان بدات.. ئەوانیش دەباعێنن...

### 52- لەفارگۆنی نەفەرەکاندا

بێریڤان لەپاڵ پەنجەرەکەدا دانیشتووە. سیڤان لەتەنیشتییەوە.. کزو خەمبارو بێدەنگن...

قاچاخچییەکان بەشمەکە قاچاخەکانیانەوە بەنێو فارگۆنەکان هاتوچۆیانە.. دێنە کابینەکەی سیڤان و بێریڤانیشەوەو دەگەڕێنەوە...

بێریڤان ماندووو خەواڵووە..

سیڤان: بێریڤان؛ ئاسکۆڵەکەم.. کەمێک بنووە.. رەنگت پەڕیوە... دەبنووە...

لەوێستگەیەک، بەندێک لەنێوانی دوو ژەندرمەدا سەر دەخرێتە نێو شەمەندەفەرەکەوە.. تارێک و کیسەیەکی بەدەستەوەیە...

(پێویستە پێشان رێ بۆ ئەم لەقتەیە خۆش کرابێت)

وێنەی دەردناکی شەوانەی نێو شەمەندەفەر نیشان دەدرێت.. ئافرەت.. منداڵ، خەڵکانێک کەلەکابینەکاندا بەتێک ترنجاوی خەوتوون...

گۆرانییەکی هەست هەژێن دەست پێدەکات و گشت شەمەندەفەرەکە خامۆش دەکات، ئەو کابینەیە دەبینین کەگۆرانییەکەی تێدا دەگوترێت.

بەندەکە بەکەلەپچەی دەستیەوە لەنێوانی دوو ژەندرمەکەدا دانیشتووەو تێی دەچرێنێت...[7]

((دەبێت لەم پەردەیەدا، ئەو وێنە واقیعییانەش نیشان بدرێن کەلەکاتی فیلمگرتندا دەکەونە بەر چاوی کامێراوە).

(دەبێت لەهەر وێستگەیەک وێنەی تایبەت بەهەڵکەوتی نێوچەکە نیشان بدرێن).

(دەتوانرێت ئەم وێنانە لەخەیاڵ و روانگەی بیری حامۆو سیلۆو سیڤان و ئەبوزەڕەوە پێشچاو خرێن.. وێنەی جۆراو جۆری ژیان.. خەڵکانێک کەدەستی دوعاخوازی بۆ شەمەندەفەرەکە هەڵدەسوڕێنن... منداڵانێک کەلەنێو گۆلاودا مەلە دەکەن.. یانی هەرچییەک لەکاتی رێبڕینی شەمەندەفەردا دەکەونە پێش چاوان).

منداڵێک پێڵاوەکانی پیاوێکی جلشینی شیکپۆش دەدزێت...

پیاوە جل شینەکە لەوێستگەی دیاربەکر دادەبەزێت...[8]

شەمەندەفەرەکە بەرێگەوەیە.. رۆژ بۆتەوە..

### 53- بەرێگەوە

دووبارە دەستەیەک دز چاودێری فارگۆنەکان دەکەن.. ئەبوزەڕ لەفارگۆنەکەیدا پەرکەم دەیگرێت... دزەکان ئەو هەلە دەقۆزنەوەو دەچنە فارگۆنەکەی ئەوەوە.

کاتێک ئەبوزەڕ لەنێو مەڕەکاندا پەلەقاژێیەتی، دزەکان، هەر مەڕەو بەزیندوویی هەڵی دەدەنە خوارەوە...

هاوڕێکانیان بەترومبێلێکەوە دووی شەمەندەفەرەکە کەوتوون.. دەستبەجێ مەڕەکان سەردەبڕن و دەیانخەنە ترومبێلەکەوە..

حامۆ پێی دەزانێت و هاواری لێ هەڵدەستێت...

حامۆ: ئەو دزانە بگرن.. ئەو دزانە بگرن..

دزەکان خۆ هەڵدەدەنە خوارەوە..

شەمەندەفەرەکە وێستێکی ناچاری دەکات..

نەفەرەکان یەکسەر بەسەر یەکدا دەکەون..

حامۆ خۆی لەشەمەندەفەرەکە هەڵدەداتە خوارەوە...

دزەکان بەترومبێلەکە هەڵدێن..

حامۆو سیڤان دەچنە فارگۆنەکەی ئەبوزەڕەوە..

حامۆ شێتگیر دەبێت.. بەشەق بەردەبێتە ئەبوزەڕێک کەهێشتا نەهاتۆتەوە سەرخۆ..

پەزەکان لەفارگۆنی شەشەم دەردەکەن و لەپێنج فارگۆندا جێیان دەکەنەوە.. سێ مەڕ لەفارگۆنە (D.D.T)یاوەیکەدا مرداربوونەوە.. هۆکەی نازانن..!

حامۆ: پێم گوتیت با بێریڤان لەتەکماندا نەیەت.. ئەو ماکی ئەم هەموو بەدبەختییانەمانە.. بڕوانە مەڕمان لێ دەدزرێت.. مەڕمان لێ دەمرێت...

سیڤان: بێریڤان چ بکات؟ کەمەڕ دەدزرێت یان دەمرێت، دەبێت تاوانی بێریڤان چ بێت؟

حامۆ: تەنها بوونی ئەو لەتەکماندا بەسە..! تەنها بوونی ئەو لێرە..!

سیڤان: بابە تۆ ناهەقی دەکەیت..

حامۆ: دەی سا بۆچی ئەم هەموو بەدبەختییەمان بەسەر هات.. بۆ؟ هۆیەکی دی لەئارادا هەیە..؟

سیڤان بێ دەنگ دەبێت.. هیچ چارەیەکی نییە.. حامۆ بەتوڕەییەوە هەر بۆڵەی دێت.

حامۆ: تەنها ئەو مایەی ئەم هەموو بەدبەختییانەیە.. تەنها ئەو..!

### 54- وێستگەیەک

بەنێو ئەو خەڵکانەدا کەچاوەڕێی شەمەندەفەر دەکەن، ئافرەتێکی تێک سمراوی سۆزانی پانتۆڵ لەپێ، بەشەلەشەل، لەگەڵ گەوادە لەرکەلەکەیدا رێدەکات... بەلەنگین و پانتۆڵە تەسکەکەی، سیلۆ گرفتار دەکات..

ژنە سواری شەمەندەفەر دەبێت.. شەمەندەفەر دەکەوێتە رێ..

### 55- شەمەندەفەرەکە

ژنەکە بەرێڕەوی شەمەندەفەرەکەدا تێدەپەڕێت و دەچێتە کابینەیەکەوە.. بەلارو لەنجەیەکی خۆکردی واوە رۆدەنیشێت کەسەرنجی هەمووان رادەکێشێت...

یەکەم کاری خێری لەتەوالێتەکاندا ئەنجام دەدات.. گەوادەکەی لەبەردەم دەرگەکەدا رادەوەستێت...

### 56- فارگۆنە (D.D.T)اوێکە

چەند مەڕێکی دی مردار دەبنەوە..

دەبێت مرداربوونەوەی مەڕەکان وا نیشان بدرێت کە گرژییەکە ئاڵۆزتر کات..

### 57- وێستگەیەك

لەپاڵ شارۆچکەیەکی گەورەدا، وێستگەیەکی چکۆلەی چۆڵە.. ژەندرمەکان، بەندەکە لەشەمەندەفەرەکە دادەبەزێنن.. بەندە گۆرانی بێژەکە، هەستی نەفەرەکانی هەژاندووە.. رەنگە گۆرانییەکە لەوەوە فێربووبن.. لەکاتی دابەزینیدا، نەفەرەکان گۆرانییەکە دەچڕێنن.. ئەو کۆمۆنیستانەی لەشەمەندەفەرەکەدا رۆژنامە دەفرۆشن، گۆرانییەکەی لەگەڵدا دەڵێنەوە...

مەڕە مردارەوەبووەکان دادەگرن..

بێریڤان دەڕوانێتە سیڤان و سیلۆو ئەبوزەڕو هەندەك لەو نەفەرانەی مەڕەکان دادەگرن.. حامۆ، ئەو پیاوە دڵڕەقە، چیچکەی کردووەو بەبێدەنگی فرمێسك هەڵدەوەرێنێت..

لەداگرتنی مەڕەکان دەبنەوە.. مەڕەکانی دی دەخزێننە سێ فارگۆنەکەوە.. حامۆ لەپڕێکدا رادەپەڕێت و دەست دەداتە گۆچانەکەی و بەردەبێتە گیانی سیڤان..

حامۆ: ئەمە هەمووی بەهۆی تۆوە بوو..! ئەم هەموو بەدبەختییەمان بەهۆی ژنە نەفرەت لێ کراوەکەتەوە بەسەرهات..! بەگوێت نەکردم.. بەگوێت نەکردم.. تۆ مایەی بەدبەختیمانیت.. نەتویست گوێم لێ رابگریت..

شێلگیرانە لێی دەدات...

بێریڤان چیدی ناتوانێت دان بەخۆدا بگرێت و ببینێت لەمێردەکەی دەدرێت، پێشی پێ دەگرێت.. حامۆ لەویش دەسرەوێنێت... خەڵکی رادەکەن و هەوڵ دەدەن دەستی حامۆ بگرن، بەڵام ناتوانن چاری کەن...

حامۆ: بەرمدەن...! چ دەخلێکتان داوە بەسەرەوە...؟ خۆتان لەکاری من هەڵمەقورتێنن..! یەکێکیان کوڕمەو ئەوی دی بووکمە.. ئارەزوو بکەم لێیان دەدەم، بمەوێت دەیانکوژم..!

سیڤان هێجگار تووڕە بووە... بەڵام ناتوانێت لەرووی بابیدا هەڵگەڕێتەوە... لەحەشمەتدا خۆی دەدات بەزەوی داو بەرۆکی خۆی دادەدڕێت..

حامۆ: تۆ هەی دێڵە پیسەی نەفرەت لێکراوە..! تۆ هەی پەڵەی خەجاڵەتی خانەوادەکەمان.. هەی سۆزانی سووکی بێ ئابڕوو..

شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات..

حامۆ لەحەشمەتدا دەگری..



حامۆ: فەوتاین، گشت ئومێدێکمان رما.. لێ بووینەوە.. تێدا چووین! ئێستا چ بەجامبازەکان بڵێین؟ مەڕی بێگەردن.. مەڕی مردارەوەبوو... هۆ خودا گیان.. هۆ خودای مەزن.. چمان کردبوو..؟ چ تاوانێکمان هەبوو..؟

هەندەك لەنەفەرەکان بەزەییان پێیاندا دێتەوەو خەمیان دەخۆن.. هەندەك گاڵتەیان پێ دێت و بزە دەیانگرێت...

شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات..

سیڤان پەلی ژنەکەی دەگرێت و دەچنە یەکێك لەفارگۆنی پەزەکانەوە.. حامۆ دەچێتە فارگۆنەکەی دییەوە.. تووڕەو بێچارەیە...

سیلۆ دەچێتە فارگۆنی سێهەمەوە...

کاتی بەڕێکەوتنی شەمەندەفەرەکە، ئەبوزەڕ لەوێستگەکە، بێ دەستەڵاتانە بەدیار مەڕە مرداربووەکانەوە هەڵتروشکاوە..

### 58- فارگۆنەکەی سیڤان

بێریڤان و سیڤان لەفارگۆنەکەدا لەپاڵ یەکدیدا دادەنیشن.. سیڤان سەری خستۆتە نێو لەپییەوەو بیر دەکاتەوە.. بێریڤان بێدەنگ دەگری... سیڤان لەسەرخۆ سەرهەڵدەبڕێت...

سیڤان: مەگری... تکا دەکەم مەگری.. بێریڤان.. هەر گەڕاینەوە ئیدی هەموو شت کۆتایی پێ دێت، ئاسکۆڵەکەم... بەجێیان دەهێڵین.. بەڵکە لەئەنقەرە کارێکم گیرکەوێت.. هەندەك دۆست و ناسیاوم لەئەنقەرە هەن.. بەڵکە کارێکم بۆ پەیداکەن.. دەتوانم بارکێشی بکەم.. دەتوانم بار بدەم بەشانمدا تاتۆ چاك بییەوە.. تۆ دەردەداریت بێریڤان.. هەوڵی چاك بوونەوەت دەدەین. من بڕوام بەتۆیە بێریڤان.. تۆش بڕوات بەمن هەبێت.. ئازار هەر کۆتایی دێت.. ئاسکۆڵەکەم.. گشت ئازارێك... گشت تاریکاییەك.. بمبەخشە، بمبەخشە.. چ بکەم بابمە.. ناتوانم دەستی لەروودا هەڵبێنمەوە.. تکایە لەبێ دەسەڵاتیم خۆش بە.. دەستم بەستراوە.. کەس لەدەردمان حاڵی نابێت کەس ناتوانێت هیچمان بۆ بکات خۆمان نەبین..!

### 59- فارگۆنەکەی حامۆ

حامۆش خەمبارو بێ چارەیە..

پەزەکان شەکەت و ماندوون...

### 60- فارگۆنەکەی سیلۆ

(لەو دەمەوە ئافرەتە سۆزانییەکە سواری شەمەندەفەرەکە بووە، چاوی سیلۆ بەدوویدا وێڵە، گەوادەکەی هەستی پێ کردووە).

وایپێدەچێت سیلۆ هیچ باکی ئەوەی نەبێت چ لەدەورو بەری دەگوزەرێت. پووڵەکانی دەژمێرێت.. کەمێکی دەخاتە گیرفانییەوە، ئەوی دی دەخاتە نێو پشتێنەکەیەوە..

شەمەندەفەرەکە رادەوەستێت..

سیلۆ دەرگەی فارگۆنەکەی دەکاتەوەو دەڕوانێتە دەرەوە.. دەبینێت وا ژنە سۆزانییەکە، بەبەر فارگۆنەکەیدا تێدەپەڕێت.. بەوردی تێی دەڕوانێت.. گەوادەکە لەپشتی ئافرەتەکەوەیەو هەست دەکات و لەسیلۆ نێزیک دەبێتەوە...

گەوادەکە: ئافرەتێکی شۆخە، وانییە کوڕی باش؟ گەر زەوق و پووڵت هەبێت، یانی ............ تێ دەگەیت مەبەستم چییە، وانییە؟

سیلۆ: بەچەند؟

گەوادەکە: ئاخ، تەنها یەک سەدی..!

سیلۆ: بەسەد؟

گەوادەکە: ئەویش لەبەر خاتری تۆ..!

سیلۆ: ئاخر چۆن ... لەکوێ بیکەین؟

گەوادەکە: شەمەندەفەرەکە ماوەیەک لێرە دەوەستێت.. تادەکەوێتە رێ تۆ لەکاری خۆت بوویتەوە..! هەلی دیکەی ئاوهات بۆ هەڵناکەوێتەوە!

سیلۆ: ئەی ئەگەر بابم پێی زانی؟

گەوادەکە: پێ نازانێت... ئارەزووی خۆتە، لەدەرەوە دەڵێیت یاخود لێرە.. کەس هەست ناکات.. کەس لەنێو ئەو پەزانەدا ناتانبینێت..! بۆخۆت گوژم لێ بدە..! قەت هەلی دیکەی ئاوهات بۆ هەڵناکەوێتەوە...!

سیلۆ سەد لیرەییەک دەردەکات و دەیداتە دەستی...

گەوادەکە: ئەمە بەشی خۆمە، خۆت شتێکیش بەو بدە...

سیلۆ: تۆ پێشان ئاوهات نەگوت..! پاش ئەوە.. بڕوانە.. ژنەکە وادەڕوات..!

گەوادەکە: هەر ئێستا دێتەوە.. کارێکی چکۆلە بەئەنجام دەگەیەنێت! ئێستا دێتەوە.. ئێمە سەرراستین، پووڵەکەت نابەین و هەڵبێین.. هیچ خەم مەخۆ...

سیلۆ: دەپێی بڵێ باسەرکەوێت.. ئەویش سەدییەک وەردەگرێت..!

گەوادەکە: چاکە، پێی دەڵێم.. هەر ئێستا دێت.. تا وێستگەی داهاتوو سەعاتە رێیەکە.. کاتی تەواوتان هەیە.. بەڵام لەپەلو پۆی نەخەیت.. ها! با تڵپەیەکی تەڕی بۆ ئێمەش پێ بمێنێت..!

بزەیەکی تاڵی بۆ دەکات

سیلۆ: باشە.. ئەویش سەدییەک وەردەگرێت.. ئەی ئەگەر تا بەرێکەوتنی شەمەندەفەرەکە، نەگەڕایەوە..؟

گەوادەکە: دێتەوە، دێتەوە، کاری خۆی دەزانێت.. لای ئێمە دەڵێین: هەرمێی لقی چەماوە نەرمەقووتە..! ئافرەتی شەلیش، پیاو دەتوانێت.. ئیدی دەزانیت چ دەڵێم..

هەمدیسان خەندەیەکی تاڵو بێتامی



بۆ دەکات...

ژنەکە دەچێتە تەوالێتێکەوە.. پیاوێک بەدوویدا.. سیلۆ بەپەشۆکاوی چاوەڕوان دەکات.. خەریکە ئارامی لەبەر هەڵدەگیرێت..

لەو دەمەدا حامۆ دادەبەزێت.. گەوادەکە دوور دەکەوێتەوەو خۆی بەشتێکەوە خەریک دەکات...

حامۆ: پەزەکان چۆنن؟ هیچ ڕوویداوە؟ ووریابە دەردیسەری دیکەمان بۆ نەسازێت..

هیچ بابە، هیچ.. ئومێدەوارم هیچ روونەدات...

حامۆ: وریابە کەس نەیاندزێت.. قەسەم دەخۆم، ئەمجارە هەمووتان دەکوژم...

مەڕەکان لەگەرماندا هەناسەیان سواربووە..

حامۆ دەڕوات..

سۆزانییەکە لەتەوالێتەکە دێتە دەرەوە..

شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات..

سیلۆ ئارامی لەبەر هەڵگیراوە..

ژنەکە بەرەو فارگۆنەکە دێت و گەوادەکە شتێکی بەگوێدا دەچرپێنێت.. سەیرێکی دەوروبەری خۆیان دەکەن و بەکۆمەکی گەوادەکە سەردەکەوێتە نێو فارگۆنەکەوە..

سیلۆ دەرگەکە دادەخات..

شەمەندەفەرەکە دەکەوێتە رێ...

ژنەکەو سیلۆ تێک ئالاون.. سیلۆ لەچڵەپۆپەی هەژاندایە.. ژنەکەش دەست بەلەشیدا دێنێت.. ژنە شارەزای کاری خۆیەتی..!

لەوکاتەدا پارەکە لەگیرفانی سیلۆ دەردەکێشێت..

(دووکەسی تێک ئالاو کەتەنها داوێنیان رووتە، لەنێو پەزەکاندا درێژبوون، تەکانی پێویست دەدەن).

شەمەندەفەرەکە لەوێستگەیەک دەوەستێت.. ژنەکە دادەبەزێت.. گەوادەکە چاوەڕوانی دەکات.. لەچاو گوم دەبن.. سیلۆ خۆی دەکێشێتەوە.. هێشتا تەزووی ئەو پێشهاتە خۆشە بەری نەداوە.. ئەوجا دەست بۆ پارەکەی دەبات.. پارە نەماوە.. لەوێستگەکەدا وەک شێت بەملاو ئەولادا رادەکات.. گشت جێیەک دەڕوانێت.. شەمەندەفەرەکە شووت لێ دەدات.. هێشتا لەدەوروبەری خۆی دەڕوانێت.. ناچار بەرەو شەمەندەفەرەکە رادەکات و سوار دەبێتەوە...

حامۆ: چ رووی داوە، هەی کەڵەکچی؟ بەدووی چدا وێڵیت..؟

سیلۆ: هیچ ..بابە... هیچ..

حامۆ: بڵێ، چ ڕوویداوە؟

سیڤان و بێریڤان لەفارگۆنی مەڕەکاندا..

سیڤان: بەڵکە لەئەنقەرە کارێکم چنگ کەوێت.. چەند دۆستێکی چاکم لەئەنقەرە هەن، رەنگە بتوانن کارێکم بۆ پەیداکەن.. دەتوانم بارکێشی بکەم.. بار لەشانم دەکەم تا تۆ چاک ببیتەوە.. بێریڤان تۆ نەخۆشیت.. بەڵام چاک دەبییەوە! من

بڕوام بەتۆ هەیە؛ بێریڤان، تۆش بڕوا بەمن بکە..!

حامۆ بەدیار پەزەکانەوە..

حامۆ لەسەر کوتە کاغەزێك حسێبێك دەکات.. زۆر پەشێوە...

سیلۆ بێ دەستەڵاتانە دانیشتووە، گیرفانەکەی خۆی دەپشکنێت، هیچیان تێدا نەماوە...

## 61- شەمەندەفەرەکە لەئەنقەرە نێزیك دەبێتەوە

گەڕەکی کۆلیتە نشینەکانی ئەنقەرە...

(لەو شارەدا، هەتا دێت، بێریڤان بێهێزو کەمتواناتر دەبێت.. لەگەڵ هەر مەڕ دزینێکدا لەگەڵ هەر مەڕ مرداربوونێکدا، یانی لەگەڵ هەر زیانێکی مێگەلەکەدا، هێزو توانای ئەویش لەکەمیو کزی دەدات.. دواهەمین لەقتەی نێو شەمەندەفەرەکە کەمێك پێش گەیشتنە ئەنقەرە، بێریڤانو سیڤان نیشان دەدرێن).

سیڤان: بێریڤان؛ واگەیشتین، ئەمە ئەنقەرەیە.. ئێرە دەرمانی گشت دەردێکی لێ چنگ دەکەوێت، ئاسکۆڵەکەم.. ورەت بەرز بێت.. بڕوام پێ بکە چاك دەبیەوە..

## 66- ئەنقەرە

ئەنقەرە بەو چڕیو پڕیو قەرەباڵغییەوە، بانقەکانی، پلاکاتەکانی، جامخانەی بوغازەکانی، پەیکەرو کۆتەڵەکانی، پارلەمانو ئالاکانی، هەرهەمووی نیشان دەدرێن..

پاش ئەو لەقتانە، مێگەلەکە بەشەقامێکی سەرەکیدا تێدەپەڕێت.. حامۆو سیلۆو سیڤان، ئەو شوانکارە کارامانەی لەلەوەڕگەی کێوەکاندا بەو لێهاتوییە مێگەلەکەیان پێش دەدا، لێرە، لەم دەوروبەرەدا، شلەژاوو پەشۆکاو دەنوێنن! جموجۆڵو بزووتنیان وەك لە لەوەڕگەی کێوو هەردەکاندا ئاسایيو خۆڕسکە، لێرە لەنێوشاردا سەیرو عەنتیکە دێنە پێش چاوان..!

خەڵکەکەی مێگەلەکە دەبینن، بەفیتەو هاواری شوانەکان دەخەنن...

(دەبێت لەرێگەی کامێرای شاردراوەوە، لەقتەی نێزیك بگیرێت، لەقتەی وا کەبێ دەربەستیو گوێ پێنەدان لەدەمو چاوی رێبوارەکاندا نیشان بدات).

سیڤان بێریڤان لەکۆڵ دەکات، چونکە توانای رێکردنی لەبەر براوە.. دووی مێگەلەکە کەوتووەو خەمبارو بێچارەو شەکەتو ماندوو دەنوێنێت...

سیڤان: ئەمە ئەنقەرەیە، بێریڤان؛ ئاسکۆڵەکەم.. ئەمە ئەنقەرەی پێتەختمانە. کەسەربازبووم سروودێکیان فێرکردین:

ئەنقەرە، ئەنقەرە، ئەنقەرەی رازاوە
خەمباران بەتۆ دڵیان کراوە
ئەمە پێتەختەکەمانە..

سیڤان لەبەر خۆیەوە دەبزرکێنێت..

سیڤان: ئەمە پێتەختەکەمانە.. دڵی تورکیایە.. بڕوانە چەند رازاوەیە!! لەگوتەکانیدا تەوسو لاقرتێیەکی تاڵ هەست پێ دەکرێت..

شوانەکان هەوڵ دەدەن پەزەکان چاپووکانە بئاژوون..

## 63- مۆڵگەی مێگەلەکە

پەزەکان لەپەچەیەك دەکرێن.. شوانەکان شەکەتو ماندوون..

سیڤان بێریڤان لەکۆڵی دادەگرێت..

بێریڤان حاڵی زۆر خراپە.. هەوڵ دەدات خۆی بڕشێنێتەوە.. لەو کاتەدا جامبازەکان بەترومبێلێکی شیك دەگەنە جێ..

حامۆ بەرزەپێ لەبەریان هەڵدەستێت..

جامبازەکان دادەبەزنو دێنە بەرەوەو لەمەڕەکان دەڕوانن..

جامبازەکە: بەداخەوە، پەزەکانتان پساندووە..!

حامۆ: بەدبەختی بەرۆکی بەرنەداین، نەماندەزانی چ بکەین..!

جامبازەکە: جامبازەکە: دەبێت یەك حەوتوو خەریکیان بن، لێیان گەڕێن بحەوێنەوە.. ئاوو ئالیفی چاکیان بدەنێ...

حامۆ: ئالەم شارەدا بەردیان دەرخوارد بدەین؟ ئالیف دونیایەك پووڵی دەوێت..! خێڵ چاوەڕوانمانن. زۆریان پێویست بەپووڵەکەیە.. قەت ناتوانین حەوتوویەك بەرینە سەر.. دەردی سەری زۆرمان چەشتووە.. پەزەکانمان ژەهریان دەرخوارد درا، دزران، قاچیان شکێندرا..

جامبازەکە: بەهۆی ئێوەوە زیانێکی زۆرمان لێ کەوت. ئێوە پەزەکانتان درەنگ گەیاندە جێ.. بەو شێوەیەی خۆم بەنیاز بووم، نەمتوانی بیانفرۆشم.. زیانێکی زۆرم لێ کەوت..

حامۆ: ناچاری بەرتیلدانێکی زۆر بووین.. ئاژەڵەکانمان فەوتان.. لەحاڵو بارێکی زۆر سەختدابن.. چۆن لەعاستی عەشرەتدا چاو هەڵبڕین؟

جامبازەکە: من چیمە بەسەرەوە؟ ئێوە ماڵی منتان کاول کرد.. هێشتا من خەمی ئێوەش بخۆم..؟ زیانێکی زۆرتان لێ دام، مەسەلەکە ئاوهایە حامۆغا...!

جامبازەکان دەڕۆن..

حامۆ لەبەر خۆیەوە هەر دەبۆڵێنێت..

ئەوجا بادەداتەوە سەر سیڤانو بێریڤان

حامۆ: ئێوە ماکی ئەم هەموو نەهامەتیيەن.. بۆ بەتەنها نەهاتم! بۆ لەگەڵ کەسانی نەدیوو نەناسیاودا نەهاتم..! ئاخ کە گەوج بووم، ئاخ... گوێتان لێبوو ئەو پیاوانە چییان گوت، خۆ گوێتان لێ بوو!؟

سیڤان: بابە، یەك تۆز هۆشو بیرت بێت... نابینیت حاڵی بێریڤان چۆنە؟ چۆن پیاو دەتوانێت ئالەو حاڵەشدا هێشتا هەر لۆمەی بکات؟ پیاو دەبێت کەمێك بیر بکاتەوە...

حامۆ: دەبایە ئێوە بیرتان کردبایەوە، ئێوە دەبایە بیرتان کردبایەوە، پێش ئەوەی ڤەیسیخانی ئابەو دەردە بەرن..

سیڤان: تۆ بابمیت، بەڵام کەمێك ژیرانە بیر بکەرەوە، چیدی ڤەیسیخانی نەمان، ئێمە چیدی نەماین، بابە! ئەوە جارێك لەجاران بوو! ئیدی ئەوڕۆ خێڵێکی کۆچەری دابڕاوی هەژارین.. برسیو پەشێوین.. ڤەیسیخانییان مردن، ئیدی واقع ببینە..

حامۆ: من ڤەیسی خانییم.. خوێنی پاکژی ڤەیسیخانی بەدەمارەکانمدا فڕکەدەکات.. بڕۆ گومبە لەبەر چاوم، دێڵە حالیلانییە نەفرەت لێ کراوە چەپەڵەکەشت لەگەڵ خۆت ببەو بڕۆ..

سیڤان: دەڕۆین، بەڵام یەك قرۆشمان پێ نییە..

حامۆ: منیش نیمە.. ماڵوێران کراین.. پەزەکانمان مردن، دز تالانی کردین.. ماڵمان کاول بوو.. کوا پارە؟ هیچمان هەیە؟

سیڤان: بێریڤان نەخۆشە.. دەبێت بیبەمە لای دوکتۆر.. ئایا لەسەر ئەوە ڕێك نەکەوتین؟

حامۆ: راستە، لەوبارەوە دواین.. بەڵام من لەکوێ دەمزانی ئەو هەموو بەدبەختی‌یەمان بەسەردێت..؟

سیڤان: جا ئێمە تاوانمان چی‌یە؟

حامۆ: گشتی تاوانی دێڵە نەفرەت لێکراوەکەتە..!

بەتوڕەیی‌یەکەوە کیسەی پارەکەی دەردەهێنێت.. دووسەد لیرەی لێ دەردەکات و بۆ سیڤانی هەڵدەدات.. سیڤان دەڕوانێتە پارەکە..

سیڤان: ئەو پارەیە هیچ دەردێکمان ناخوات..

حامۆ سەد لیرەیی‌یەکی دیکە دەردەکات و بۆی رادەگرێت..

سیڤان بەنابەدڵی و ناچاری پارەکە وەردەگرێت..

سیڤان: دووسەد لیرەی دیکەم بدەرێ تا بتوانم بیبەمە لای پزیشکێك.. بەڵکە بەلای کەمەوە دووسێ رۆژێکی پێ مەیسەر بکەین، یا بتوانم دەستم بەلایەکی دیکەدا بگات..!

حامۆ: دەچنە کوێ؟ لەکوێ پەیداتکەین؟ بەڵکە پێویستمان پێت بوو!

سیڤان: دۆستێکم هەیە لە "قازی عوسمان پاشا" یاساوڵی بینایە، لەوێ دەمدۆزنەوە..

حامۆ: سیلۆ، نێونیشانەکەی بنووسە. ئومێد دەکەم پێویستمان پێتان نەبێت، بەڵام گەر چارەمان نەما، ئەوا پەیداتان دەکەم.. گوم بە لەبەر چاوم..

بێریڤان لەگۆشەیەکدا هەڵتروشکاوە.. سیڤان دەچێت بۆ لای و هەڵیدەستێنێت بەڵام پاش چەند هەنگاوێك هەست دەکات کەتوانای رۆیشتنی نی‌یە، دەیکاتە کۆڵی و دەڕوات..

سیڤان بێریڤانی بەکۆڵەوەیەو بەشەقامێکی بەریندا دەڕوات..

بەدەم ڕێگەوە، چەند جارێك لەرێڕووی شوێنەکە دەپرسێت.. پێی دەڵێن قازی عوسمان پاشا زۆر دوورە.. ئامۆژگاری دەکەن سواری تاکسی ببێت.. دەپرسێت چەندی تێ دەچێت.. نرخەکەی رایدەچڵەکێنێت، بۆیە بڕیار دەدات هەر بەپێ بڕوات..

تنۆکە فرمێسکەکانی بێریڤان دەتکێنە پشت ملی سیڤانەوە..

سیڤان: مەگری، خەمەکەم گرانتر مەکە..! چاك دەبی‌یەوە.. ئەمە ئەنقەرەیە، دەرمانی گشت دەردێکی لێیە..!

ئەملاو ئەولای خۆی دەڕوانێت.. خەڵکی ی، شارێکی گەورە.. لەراستیدا سیڤان خۆی باوەڕی بەگوتەکانی خۆی نی‌یە..

## 64- بیناکە

سەرئەنجام دەگەنە ئەو شەقامەی کەخانووەکەی لێیە.. پیاوێك خانووەکەیان نیشان دەدات.. سیڤان لەبەردەم خانووە تەواو نەبووەکەدا رادەوەستێت.. سەیرێکی خانوەکەدەکەن.. خانوویەکی گەورەیە هێندەی نەماوە تەواو بێت، هەندە کارێکی وردەی وەکو دەرگەو پەنجەرەی ماوە..

## 65- ئاشیانەی پاسەوانی خانووەکە خێزانێك کەسێ منداڵیان هەیە..

کیژێکی حەوت ساڵانە.. کوڕێکی یازدە ساڵان، کوڕێکی هەراش‌تر، کەلەپۆلی پێنجەمی ئامادەیی‌یە... ژنەکەش لەشوێنێك کارگەرە.. پاسەوانەکە، بەسەرهاتی خۆی لەیەکەمین رۆژی هاتنە شاری‌یەوە دەگێڕێتەوە.. ئەو کێشەو گرفتانەی لەیەکەم رۆژەوە تووشی هاتوون. لەحاڵ و باری ئەوڕۆی خۆی رەزامەندە.. کوڕەکەی بێ‌دەنگ گوێی گرتووە. سیڤانیش کێشەو بەزمی خۆیی و بابی دەگێڕێتەوە..

سیڤان: حاڵمان شڕە.. لەگەڵ ماڵە بابمدا هەڵناکەین.. بابم تاکو بەساڵدا دەچێت، تووڕەو تڕۆتر دەبێت... حەواندنەوەمان نی‌یە...! بێریڤان ناساغە.. دەمەوێت لەماڵە بابم جودا ببمەوە.. لەدەزگەی کارگوزاریی ڕێگەوبان جێگە هەیە، بەڵام داوای شێست هەزار لیرە بەرتیل دەکەن..!

پاسەوان: گەر تۆ شێست هەزارت هەبێت، دەتوانیت لێرە کاری باشتر پەیدا کەیت.. ناسیاومان زۆرن.. یارمەتیمان دەدەن.. لەوێ، لەولاتی خۆمان ژیان نەماوە..!

سیڤان: ئێمەش تێدا چووین، نازانین چ بکەین... نەخۆشی بێریڤان پشتی شکاندووین...

پاسەوان: بۆ نەخۆشخانە، دەبێت پێشان سەرە بگریت و ژمارەیەك وەرگریت..

قوتابی ئامادەیی: سبەی پێکەوە دەچین.. گەر بمانەوێت ژمارەمان چنگ کەوێت، دەبێت زوو بکەوینە رێ..

پاسەوان: ژیان لێرە جۆرێکی دی‌یە.. هەرچەندە لێرە هەژار هەر هەژارەو دەوڵەمەند هەر دەوڵەمەندە، بەڵام جۆرێکی دی‌یە.. دەوڵەمەندی ئێرە، وەکی ئاغای ئەوێ نین..!

هەڵدەستن خانووەکە تەماشا دەکەن.. پاسەوان، ژوورەکان و مەتبەق و گەرماویان نیشان دەدات.. قوتابی‌یەکە هەڵدەداتێ...

ژنەکە: بەئومێدی ئەوەی بۆتان هەڵبکەوێت..

پاسەوان: هەموو شت لێرە ئاسانترە.. گەر پیاوی خۆی پەیداکەیت و بەرتیلی چاك بدەیت، گشت کارێکت مەیسەر دەبێت.. خەم مەخۆ، چارەسەرێك هەر پەیدا دەکەین..!

قوتابی: بابە، ئەوەی تۆ دەیڵێیت چارەسەر نی‌یە...!

پاسەوان: تۆ هەموو شت ئاڵۆزتر دەکەیت...

قوتابی: هیچ ئاڵۆز نی‌یە، بەڵکە سادەو رەوانە، بڕوانە نەخانووت هەیە، نەکار، نەپزیشك، نەپووڵ، تا مەسرەفی خوێندنی من هەڵسووڕێنیت، پارچە زەوی‌یەکت نی‌یە، هەروەکو سیڤانیت..! هۆی ئەم هەژاری‌یە چی‌یە؟ ملیۆنەها کارگەی بەشان و باهوو، خاوەنی هیچ شتێك نین، کەچی دەستەیەك خاوەنی ملیۆنەها چەندین ملیاردن..! ملیۆنەها کارگەر بەرهەم بەبەردێنن، چی لێ دێت؟ کێ ئەم سیستمەی بەرقەرار کردووە؟ دەمەوێت بڵێم، دەوڵەمەندی ئێرەو ئاغای ئەوێ هەریەکن و هەمان شتن...!

لەیەکێك لەژوورە گەورەکاندا، دۆشەکێك بۆ سیڤان و بێریڤان رادەخەن.

ژنەکە: بمانبەخشن، جێگەو ڕێگەمان لەوە زێتر نی‌یە...

پاسەوان: گەر بتوانین ماوەیەکی دی لەم ئاشی‌یانەیەدا هەڵبکەین، ئەوسا

جێگەی سەرپەرشتیکەری خانوەکان دەدەنە من.. گەر خودا بیکات ئەوجا دەتوانن بێنە دیدەنیمان و هەموو پێکرا شادی بچێژین..! وەرە وەرە، ئا ئەمە دەبێتە مەتبەق، مەتبەقێکی هێجگار گەورە.. ئالێرەدا پیلکەیەك دادەنێین، هەر پلت پێوەنا، گشت بۆنێك دەردەکێشێتە دەرەوە!

ئائەمەیان دەکرێتە حەمام، هەمووی بەبەردی سپی دەنەخشێنن.. ئالێرەدا دەتوانیت هەتا دڵت دەخوازێت خۆت بشۆیت..! تەوالێتەکە، ئالێرەدا لەتەنیشتییەوە دەبێت.. ئێرە دەکرێتە ژووری نوستن، تەنها یەك دانە نا..! ئەمەیان بۆ منداڵانە..! ئەمە ژووری مێوانەو ئەوەش ژووری کارەکەرە.. ئەمەش هۆڵو ژووری نانخواردن..!

قوتابی: بابە، هەمدیسان خەون دەبینیت؟ چۆنت رێگە دەدەن تۆ ئالێرەدا بژییت؟ پێم بڵێ کێ لەم جۆرە خانوانەدا دەژی؟ کێ؟ تۆ؟؟ یا سیڤان؟ لەم کۆمەڵگەیەدا چەند چینێك هەن، کارکەری بەرهەمهێنەرو چینە دەستڕۆیشتووەکان، کەئەوانی دی دەخەنە خزمەتی خۆیانەوە... بۆرژواو کاپیتالیستەکان.. کاپیتالیستەکان ئەو سەرمایەیان چۆن پێکەوە ناوە؟ تۆو کارکەرانی دی هەڵدەپەرێنن و لێهاتووانە رەنجی شانتان لێ دەدزن...!! سیڤان پێم بڵێ تۆ سەر بە چ چینێکیت؟

سیڤان: ئێمە؟ ئێمە پارتی عەدالەت هەڵدەبژێرین..

قوتابی: بۆ؟ لەبەر چی؟

سیڤان: چوزانم بۆ..! کەس خۆی لەئێمە ناگەیەنێت..! هیچ پارتێك بەدەنگمانەوە نادێت..!

پاسەوان: بروانە، هەقتە...! گەر لێرە، لەم ئەنقەرەیە، سیاسەتمەدارێکت نەبێت، نوێنەرێکی پارلەمانت نەبێت پشتت بگرێت، تاماویت هیچ بەهیچ ناکەیت..!

سیڤان: یانی دەتوانین بێریڤان بەرینە نەخۆشخانە؟

### 66- نەخۆشخانە

قوتابییەکەو سیڤان هەرزوو دەگەنە نەخۆشخانە.. لەریزدا راوەستاون، تا ژمارەیەك وەربگرن.. هەرچەندە تا ئێوارە چاوەروان دەکەن، هیچیان دەستگیر نابێت.. بەنائومێدی دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە...

### 67- مۆڵگەی مێگەلە

سیڤان دێت بۆ لای بابی..

سیڤان: بابە بێریڤان زۆر ناساغە، گەر فریای لای دوکتۆرێکی چاکی نەخەین دەمرێت.. ئەورۆ چووینە نەخۆشخانە تا پسووڵەیەکی سەرەمان چنگ کەوێت،



بەڵام بێهوودەبوو.. لێرە هەموو شت بەپارەیە.. گەر یەکێکت نەبێت کۆمەکت پێ بکات، ناتوانیت شەقاوێك هەڵنێیت..! بەڵکە بەجامبازەکان بڵێیت یارمەتییەکمان بدەن..!

حامۆ: یارمەتی چمان بدەن؟

سیڤان: بەڵکە کەسێك بناسن..!

حامۆ: هیچ کاریان نییە ئەوە نەبێت یەکێك بۆ تۆ بدۆزنەوە..! من ناتوانم رووی شتی ئاوهایان لێ بنێم..!

سیڤان: دە شتێك پارەم بدەرێ، بێریڤان دەبەمە لای پزیشکێك...

حامۆ: پارە، پارە، تۆ جگە لەپارە هیچی دی نازانیت.. پارە لەکوێ بهێنم؟

سیڤان: گفتی دەهەزار لیرەت پێ نەدام؟

حامۆ: دەهەزار لیرەی چی؟ هیچم پارە هەیە؟

سیڤان: باشە، هیچ نەبێت هەزار لیرەم بدەرێ...

حامۆ بەتورەییەکەوە پارەی دەداتێ..

حامۆ: ئەوە پێنج سەد لیرە.. بەڵام جارێکی دی بۆ پارە نەیەیتەوە لام! ئیدی هیچم نییە..!

### 68- خانووەکە

پاسەوانەکە لەو ماوەیەدا لەگەڵ چەند کەسێك قسەی کردووە...

پاسەوان: بۆ مەسەلەی کار پەیداکردن بۆ تۆ لەگەڵ چەند دۆستێکم قسەم کرد..

سیڤان: سوپاست دەکەم...

پاسەوان: دەتوانیت سێ‌چوار رۆژێك بارکێشی بکەیت، گەر دەتەوێت دەتبەمە ئەوێ..

سیڤان: زۆر چاکە.. بێریڤان چۆنە؟

پاسەوان: ئەورۆ حاڵی باش بوو.. وا لەسەرەوەیە..

سیڤان: سوپاس..

بێریڤان حاڵی باشترە..

بەسەرهاتی نەخۆشخانە بۆ بێریڤان دەگێڕێتەوە...

سیڤان: زۆر چاوەڕوانمان کرد، بەڵام بەداخەوە سەرەمان بەرنەکەوت.. سبەی هەمدیسان هەوڵ دەدەینەوە.. گەر سەری نەگرت، ئەوسا دەچینە لای پزیشکێك.. باسی حاڵی خۆمانی بۆ دەکەین؛ بێریڤان.. ئەورۆ رەنگو رووت باشترە... هەر بگەینە لای دوکتۆرێك، چاك دەبییەوە، دەیبینیت..

بەڵام لەوە ناچێت بێریڤان بەشداری ئەو ئومێدەی بکات.. زۆر بەسۆزەوە مێردەکەی لەئامێز دەگرێت..

### 69- نەخۆشخانە

دووبارە لەریزدا راوەستاون.. لەپرێکدا سیڤان ئارامی لەبەر هەڵدەگیرێت و ریزەکە جێ دەهێڵێت... لەگەڵ قوتابییەکەدا لەنەخۆشخانە دێنە

دەرەوە.. پرسیاری پزیشکێکی لێ دەکات...

سیڤان: هیچ پزیشکێك ناناسیت؟

قوتابی: نەخێر..

لەناکاو تەختەنووسی پزیشکێکی ژنان دەبینن..

قوتابی بڕوانە ئێرە...!

**70- خانووەکە**

سیڤان هەوڵ دەدات بێریڤان بۆ چوونە لای پزیشکێکی ژنان ڕازی بکات.. لەبەری دەپاڕێتەوە کەهەمدیسان مان نەگرێت.. بێریڤان ڕازی دەبێت...

**71- عەیادەی دوکتۆر**

دێنە عەیادەکەو چاوەڕوان دەکەن.. بێریڤان کەلەپێشدا ڕازی‌بوو، ئێستا خەریکە سەرکێشی بکات..

پزیشك: چیتە؟

سیڤان: بێریڤان نەخۆشە..

پزیشك: گەر ئەو نەخۆشە، ڕێگەی بدە خۆی قسە بکات..

سیڤان: قسە ناکات..

پزیشك: لەبەر چی؟

سیڤان: ساڵێکە ئاوهای بەسەر هاتووە.. هیچ قسە ناکات..!

پزیشك: دەی سا چی‌یەتی؟

سیڤان: منداڵمان نابێت.. منداڵێکمان بەمردوویی بوو، یەکێکیان لەبارچوو.. ئەوی دیکەش پاش لەدایکبوونی مرد..!

پزیشك: هیچ کات چوونەتە لای دوکتۆر؟

سیڤان: نەخێر...

پزیشك: باڵەوێدا ڕاکشێت..

سیڤان: لەوێدا ڕاکشێ، دوکتۆر دەیەوێت فەحست بکات..

بێریڤان نابزوێت.. سیڤان شتێکی بەگوێدا دەچرپێنێت...

بێریڤان بەنابەدڵی ڕادەکشێت..

پزیشکەکە خۆی ئامادەکردووە..

پزیشك: پشتت هەڵماڵە..

بێریڤان هیچ نابزوێت.. سیڤان هەوڵ دەدات یارمەتی بدات.. بێریڤان ڕێگەنادات..

پزیشك: بەهـ، بەهـ..!

سیڤان هەمدیسان شتێك بەگوێی بێریڤاندا دەچرپێنێت..

پزیشك: ئەوە چی‌یە؟ هاتوون لێرە گاڵتەبازیی بکەن؟

سیڤان: نەخێر گەورەم، مەسەلە ئەوەنی‌یە.. هێشتا پزیشکمان نەدیتووە بێریڤان ڕانەهاتووە.. شەرمی بەخۆی دێت..

پزیشك: شەرم لەچ دەکات؟ کەحاڵتان وایە، کەرێگەنادەن دوکتۆر دەستتان تێوە بدات، بۆ دێنە لای دوکتۆر؟ جگە لەوە، چی پێوە ماوە تاپیاو دەستی تێوەبدات؟؟؟

سیڤان: گەورەم، هەرکەس داب‌و نەریتی خۆی هەیە..!



پزیشك: داب‌و نەریت لای دوکتۆر ناخوات..!

پزیشکەکە تووڕە بووە.. واپێدەچێت بیەوێت بیانکاتە دەرەوە.. چەند خەتێك بەکاغەزەکەی بەردەمیدا دەکێشێت..

پزیشك: پێویستە ئەم دەرمانانە بخوات.. هەر کاتێکیش داب‌و نەریتی خۆتان گۆڕی، ئەوجا وەرنەوە..! بەڵام گەر هەر بەو جۆرە مانەوە، ئەوا چیدی مەیەنەوە..!

سیڤان پارە لەگیرفانی دەردەهێنێت..

پزیشك: پارە لەدەرەوە دەدرێت...

**72- ئەجزاخانە**

دەرمان دەکڕن.. دەرمانگەرەکە چۆنیەتی بەکارهێنانیان بۆ ڕوون دەکاتەوە..

دەرمانگە: ئەمە بۆ گورچیلەو هەوکردنی بۆریەکانی میزە، ڕۆژی سێجار، هەرجارەی کەوچکێکی چا دەکەنە پەرداخێك ئاوەوەو دەیخۆنەوە..

**73- خانووەکە**

بێریڤان دەرمانەکان‌و کەمێکیش خواردن دەخوات.. هەموو خەریکن کەمێك هانی بدەن..

قوتابی: براژن؛ تا دەرمانەکان بەرێك‌و پێکتر بەکاربهێنیت، زووتر چاك دەبی‌یەوە.. خەمت نەبێت..

سیڤان: بێگومان هەموویان بەکار دەهێنێت...!

ژنەکە: ئەوڕۆ کەمێك دەچینە دەرەوە...

پاسەوان: گازینۆیەك هەیە، نێوی "ئەنقەرەی شاد"ە، ئەوە بۆ ئێمە چاکە...

قوتابی: ئەوە چاکە بۆخۆتان بچنە ئەوێ..

سیڤان: ئەی تۆ لەگەڵمان نادێیت؟

قوتابی من دەچم بۆ کۆبوونەوەیەك بۆ گوندی (چاکیروێرن)..

هەموو دەڕۆن

**74- گازینۆکە**

گازینۆیەکی هەژارانە...

سیڤان‌و بێریڤان، پاسەوان‌و ژنەکەی...

گۆرانی بێژەکان..

قۆشمەچی‌یەکان..

بێریڤان بایەخ بەهیچ شتێك نادات‌و هیچ سەرنجی ڕاناکێشێت...

**75- شەقامەکە**

جامخانەی بوغازەکان، بانقەکان، گڵۆپە شیری‌یەکان، جل‌و بەرگەکان، ئامێری چێشتخانەو نێوماڵ..

بێریڤان‌و سیڤان لاسەرلایی لەو شتانە دەڕوانن... پاسەوانەکە یەکە یەکە بۆیان ڕوون‌دەکاتەوە ئەوانە چین‌و بۆ چین..

یەخچاڵ، گسکی کارەبایی، نرخەکانیان.. جلی بووکێنی.. بووکەشووشەی نێو جامخانەکان.. ترومبێل..

دەگەنەوە ماڵەوە..

**76- خانووەکە**

هەر هێندەی هەردوو بەتەنها دەمێننەوە، بێ هۆ بێریڤان دەست بەگریان دەکات، وەکو هەستی بەنێزیکی

مردن کردبێت. سیڤان هەوڵی هێنانە گۆی دەدات. بەسەرهاتی خۆش‌و پڕ ئومێدی بۆ دەگێڕێتەوە. بەڵام هەوڵدانی سیڤان بۆ هێنانە گۆی بێ سەمەرە. سیڤان لەئامێز دەگرێت هێندە بەتاسەوە لەئامێزی دەگرێت کەسیڤان دەهەژێنێت‌و سۆزی سەردەکات. سەرەتا بێدەنگ پاشان بەدەنگێکی نەوی لەقوڵپی گریان دەدات...

سیڤان: ئاسکۆڵەکەم، ورە بەرمەدە، بەوزوانە چاك دەبی‌یەوە، جارێکی دی ناچینەوە بەلای شوانکاری‌دا.. زۆر دڵنیام کەلەم ئەنقەرەیە گرێی بەختمان دەکرێتەوە.. بێگومانم لەوەی کەمنداڵێکمان دەبێت‌و منیش کارێکم چنگ دەکەوێت.. وانی‌یە بێریڤان؟ دەبڵێ تۆش لەوە دڵنیایت.. مژدەم بەرێ کەتۆش بڕوات وایە تەمی خەمەکانمان دەڕەوێتەوە.. بەتەنها مەمهێڵەوە، بڵێ کەتۆش بڕوات وایە چارەنووسمان گەش دەبێت.. مەگری بڵێ کەتۆش بڕوات وایە...

بێریڤان دەگری...

## 77- خانووەکە لەبەیانیدا

سیڤان‌و بێریڤان نوستوون...

سیڤان هەڵدەستێت‌و دەچێتە بەر پەنجەرەکەو دەڕوانێتە دەرەوە..

ئەنقەرە تارای رەشی شەوی دڕاندووە.. پاش کەمێك سیڤان دەگەڕێتەوە بۆ لای بێریڤان.. ماوەیەك تێی دەڕوانێت، دەبینێت دەمی داپچڕاوەو هەناسە نادات.. بەهێواشی رایدەتەکێنێت...

سیڤان: بێریڤان

توند رایدەوەشێنێت‌و هاوار دەکات.. پاسەوان‌و ژنەکەی بەهەڵەداوان خۆیان دەکەن بەژووردا...

سیڤان بێریڤان لەئامێز دەگرێت‌و بانگی دەکات.. بێریڤان مردووە.. سیڤان دەگری.. پاسەوان‌و ژنەکەی هەوڵی هێورکردنەوەی دەدەن.. سیڤان شیوەنێکی بەسۆز دەکات...

## 78- مۆڵگەی مێگەلەکە

حامۆ خەریکی فرۆشتنی پەزەکانە.. جامبازەکان لەوێن.. حامۆ سەوداو مامەڵە دەکات..

حامۆ: ئەم هەموو زیانە بەچی ببژێرین؟ ئەوانی دی چم پێ دەڵێن..؟ بەدگومان بووم..

جامبازەکە: سەوداکەمان تەواو حامۆغا، گازندە مەکە.. ئاژەڵەکانمان بدەرێ...

سیڤان دێت.. جامبازەکان پارەیان داوەو پەزەکان وەردەگرن.. هەڵەوەڕێکیان لەتەکدایە.. رەقەڵە، چەقاوەسوو.. جامبازەکان دەڕۆن...

هەڵەوەڕەکە: ئاژەڵەکان جارێ دەبێت فەحس بکرێن، ئەوجا کێشانە دەکرێن خێراکەن، خێرا.. دەی بجووڵێن..!

سیڤان دێتە لای بابی.. حامۆ هەست دەکات رەنگی پەڕیوەو زۆر تێکچووە...

سیڤان: بێریڤان مرد..!

دەموچاوی هیچ گۆڕانێکی پێوەدیاری نادات.. کاتێك ئەو بێ دەنگ دەبێت حامۆ بیردەکاتەوە.. سیلۆش گوێی لێیەو نێزیك دەکەوێتەوە..

حامۆ: چ لەتەرمەکەی بکەین..؟

سیڤان: پارەمان پێ دەوێت.. بێریڤان لەگەڵ خۆم دەبەمەوە.. ناتوانم لێرە بەجێی بهێڵم...

حامۆ: هەی گەوجە! بەزیندوویی چ خێرێکمان لەو نەفرەت لێ کراوە دیت؟ لەوێ چی لێ دەکەیت؟ ئێمە خۆمان تێیدا چووین، ئەوجا پارەش لەودا بەفیڕۆ بدەین؟

سیڤان: بێریڤان دەبەمەوە... گەر پێویست بکات دەیدەم بەشانمدا..!

حامۆ: ئەو مایەی ئەم هەموو نەگبەتیانەمان بوو... ئەو مردو ئێمەش رزگار بووین..! دەبایە هەر دەگەڵدا نەهاتبا.. مەڕەکانی کوشتین...! منداڵەکانی خۆیی کوشت..! وا خۆشی مرد..! بروسکەیەك بۆ حالیلانی‌یان دەنێرین.. بابێن‌و مەیتەکەیان بەرنەوە.. تازیندوو بوو بەحسێب گوایە بووکمان بوو... ئایا تەرمەکەشی هەر بووکمانە..؟

سیڤانێك کەتا ئێستا لەبەرامبەر بابیدا زۆر بەئارام بووە، ئیدی رەگی ئارامی دەپسێت..

سیڤان: تۆ مرۆڤ نیت.. شێتیت، پیرێکی خەرەفاویت.. ئیدی بەسە، تەواو.. بەڵام..

حامۆ: ئەوە لەروومدا هەڵدەگەڕێیتەوە..؟

سیڤان: بێگومان..! چۆن بەئینسانێکی وەك تۆ بڵێم بابە..! بەسە بەس.. ئەوەی پێت کردین بەسە..!

سیڤان هەڵمەت بۆ بابی دەبات..

سیڤان: تاوانی مردنی بێریڤان لەئەستۆی گشتماندایە..! پێش هەموومان تۆ.. تێدەگەیت.. تۆ.. تۆ..!

حامۆ لەپڕ رادەپەڕێت، هەولیش دەدات ئارام بێت..

حامۆ: من ڤەیسی خانیم..! کەس رێی ناکەوێت لەروومدا راست بێتەوە هەڵەی ئاوها نەکەیت.. دەنا لمۆزت دەشکێنم..!

زللەیەك لەپەنا گوێی سیڤان دەدات..

هەڵەوەڕەکە بەدەم هەراشی خۆی تێ هەڵدەقورتێنێت..

هەڵەوەڕ: بیبڕنەوە، ناتانەوێت یەکدی بخۆن..؟ چ بووە؟ دێڵێك مردووە؟ رۆژی هەزاران کەس دەمرن.. یەکێك زێتر مرد..! خودا لێی خۆش بێت.. ئیدی بڕایەوە.. ئەم چەقەچەقەی پێناوێت..! پێتان وایە هێشتا دڕندەن..؟ جارێ پەزەکان تەسلیمی من بکەن، ئەوجا خودای دەکرد یەکدیتان دادەپاچی، یایەکدیتان دەخوارد.. من هەقم چی‌یە چ گەڤێك دەخۆن..!

ئەو توڕەیی‌یەی لەدەروونی سیڤاندا بەرامبەر بابی پەنگی خواردۆتەوە، ئێستا بەهەڵەوەڕەکەی دەڕێژێت.. لەپڕ ئامبازی قۆرتمی دەبێت.. بێ ئەوەی وشەیەك بڵێت، دەستی لێ توند دەکات..

چ سیلۆو چ خەڵکانی دی، هەوڵ دەدەن کابرای هەڵەوەڕی لەدەست قوتارکەن.. بێ سوودە.. سیڤان بەچنگۆڵەیەك پێی کابرا لەزەوی دەبڕێت..

بەهاوارو لوورەلوور، کابرای لەژێر چنگ دەردەهێنن، بەڵام کابرا خپ بووە.. خەڵکەکەی دەوروبەر شاڵاو بۆ سیڤان دەبەن، هەموو تێی دەسرەوێنن. پۆلیس سیڤانیان لەچنگ رزگار دەکات، لەئوتومبێلەکەیانی دەخزێنن‌و دەڕۆن.

## 79- خانووەکە

حامۆ بەچارەیەکی تاڵ‌و پڕ رقەوە لەبێریڤان دەڕوانێت..

مێشێك لەسەر رووی بێریڤان نیشتۆتەوە..

پاسەوان‌و ژنەکەی بەروویەکی خەمبارەوە

پاسەوان: بێریڤانی بەستەزمان.. ئێستا چی لێ دەکەن، لالۆ حامۆ..؟

حامۆ: بروسکەیەك بۆ حالیلانی‌یان دەنێرم‌و دەڵێم وەرن قسە لەگەڵ خوشکەکەتان بکەن..!

پاسەوان: قسەی چی..؟

حامۆ: ئەوان هەردەم بەئاواتی ئەوەوە بوون کەقسەیەکی لەگەڵدا بکەن، ئیدی ئێستا بۆیان هەیە..! خۆ من نەفرەتلێکراوی ئاوها تاماڵەوە نادەم بەکۆڵمدا..! ئەمە حالیلانی‌یە، ئەم هەموو ماوەیە لەبەدبەختی زێتری بەسەر شانی ڤەیسی‌خانی‌دا نەهێناوە..! نایبەمەوە.. لەم دەست تەنگی‌یەدا پارەی تێدا سەرف ناکەم..! حالیلانی‌یان دەیانخواست لەگەڵ خوشکەکەیان بدوێن، نێونیشانەکەیان بۆ دەنێرم، بابێن لەگەڵی بدوێن..!

پاسەوان: ئاخر من ناتوانم تەرمێك گل بدەمەوە.. من چی بەخاوەن ماڵ بڵێم؟ مردوویەك..

حامۆ: هەر ئێستا بروسکەیەکیان بۆ دەنێرم. دڵنیام بەدوو رۆژ دەگەنە ئێرە..!

پاسەوان: ئاخر تا دوو رۆژی دی بۆگەن دەکات..

حامۆ: با بۆگەن کات..! حالیلانی‌یان خۆیان لەخۆیاندا هەر بۆگەنن! زیندوو مردوویان.. هەموو بۆگەنن..!

حامۆ دەڕوات..

پاسەوان: من ناتوانم گلی دەمەوە، خەبەری پۆلیس دەدەم، ئەوکاتە فڕێی دەدەنە کۆڵان..

حامۆ: بەمن چی؟ خودای دەکرد فڕێیان دەدایە سەرەنوێلکەوە..!

پاڵێك بەکابراوە دەنێت وبەرەو دەرگەکە دەڕوات..

پاسەوان: مەیتەکەتان بەرنەوە.. من مردوو گلنادەمەوە.. من چاکەم کرد.. ئێستا گەوج دەرچووم..

ژنەکەی: واز بێنە پیاوەکە، واز بێنە.. تێك چوویت..؟ چۆن پیاو ئاوها لەمردوو دەکات..؟ واز بێنە..

ژنەکەی رێ نادات چیدی بێریڤان بەدووی خۆیدا بەکێش کات.. پاسەوانەکە بەدووی حامۆدا رادەکات..

رووخساری بێریڤان بەمردوویی دەبینین..

## 80- پۆستەخانە

حامۆ بروسکەیەك بەپیاوێك دەنووسێت...

نێونیشانەکەی پێ‌دەڵێت..

حامۆ: بەپەلە وەرن. لەگەڵ خوشکەکەتان بدوێن، زۆر ناساغە.

ئیمزا- حامۆی ڤەیسی خانی

پاش ئەوەی کابرا بروسکەکەی نووسی، حامۆ دەیباتە لای پەنجەرەیەك.. سیلۆ رۆژنامە دەخوێنێتەوە.. لەرۆژنامەکەدا شتێك دەربارەی قاچاغی شتی کۆن‌و عەنتیکە نووسراوە.. تەبەقە قورقوشمی کۆنەو لەسەر نووسراو کەبایی ملیۆنەهان، بەقاچاخ بۆ دەرەوە براون.. رۆژنامەکە وێنەی یەکێك لەقاپولکەکانی تێدایە کەسیلۆ بەچەرچی‌یەکەی فرۆشتن..

سیلۆ گڕ دەگرێت..

سیلۆ: هەی کوونی..! کیلۆیەك کشمیش، کیلۆیەك لوقم، سی‌و دوو لیرە... هەی چەرچی کەڵەکەباز..!

حامۆ پارەی بروسکەکە دەدات‌و دێتەوە دواوە..

## 81- شەقامەکە

حامۆو سیلۆ بەشەقامەکەدا دەڕۆن.. حامۆ لەپێشەوەیەو سیلۆ بەدوویدا. قەرەباڵغی، جامخانە، ئەنقەرە، چڕی‌و ئاڵۆزی‌ی.. حامۆ لەپڕێکدا ئاوڕ دەداتەوە.. سیلۆ نەماوە.. بەدووی خۆیدا دەڕوانێت.. ئارامی لێ دەبڕێت. لەپڕ لەو قەرەباڵغی‌یەدا دەیکاتە هاوارێك، وەکو هاواری نێو لەوەڕگەکانی..

حامۆ: سیلۆ... سیلۆ...

پرسیار لەخەڵکی دەکات.. هاوار دەکات.. ئالەو شارە مەزنەدا تاك‌و تەنها دەمێنێتەوە.. دەقیژێنێت..

حامۆ: سیلۆ...

شار لەجەنجاڵی خۆی ناکەوێت..

بانقەکان.. جامخانەکان..

حامۆ: سیلۆ...

پاش لەقتەی ئاپارتمانێك‌و پەیکەرێك، تیپێکی مۆسیقای سوپا پێشان دەدرێت کەبە ئاڵاکانیانەوە رەودەکەن..

بێریڤان مرد.. سیڤان لەزیندان‌دایە.. سیلۆ هەڵهات.. بەڵام ژیان هەر بەردەوامە.. پاش ئەو لەقتانە.. هەراو هوریای شارو یەکێك لەو گۆرانیانەی لەسەرەتا بیستران، کۆتایی بەفیلمەکە دێنن..

ڕەنگە "جەردەکان نەتوانن دنیا داگیرکەن"

**کۆتایی**

## پاشەکی

لەوڵاتێکدا کەخوودەو پۆستاڵ‌و نێزە رێبەرن، کەجەورو ستەمی نەتەوایەتی بەچڵەپۆپەی دڕندایەتی گەیشتووەو هەتا وشەی (کورد)و بوونی (کورد) بەپێی یاسا یاساغە، کەڵەمێرێکی جوامێری کورد، زۆر چاونەترسانە، لەکونی کلۆمی گرتوخانەوە، دوربینی چاوەکانی بەکوانووی زام‌و ئازارو دەردەکۆمەڵایەتی‌یەکانی نەتەوەکەیەوە دەنێت‌و زۆر لێهاتووو ژیرانە، درامای وایان لێ ساز دەدات کەپەردەی سینەمای جیهانیان پێ بڕازێنێتەوەو بەزۆربەی هەرەزۆری زمانە زیندووەکانی جیهان دۆبلاژ بکرێن‌و دەیان خەڵاتیان بەکەمەردا بکرێت..

(یەڵمان)ی جوانەمەرگ، خەونی پەلکەزێرینەی خۆیمان ئاوها بەگوێدا دەدات:

"بەلای منەوە، هونەر هەمیشە یەکێك لەئامرازە گرنگەکانی خەباتی گەلەکەم بووە لەپێناوی ئازادی‌یدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، نابێت سیاسەت‌و هونەر تەواو تێکەڵ بکەین. هونەر دەتوانێت کۆمەك بەکردە سیاسی‌یەکە بکات، بەڵام ناتوانێت جێگەی بگرێتەوە"[9]

"پرسیار: بەڵام گەر پێویستی کرد، سینەما بۆ سیاسەت بەجێ دەهێڵن؟

یەڵماز: یەکسەر..! کەهەلی لەبار هاتە پێش، ناتوانم بڵێم: بەیارمەتی، من دەبێت جارێ فیلمێك دەربکەم..! پاش ئازادی‌ی، سەدان (یەڵمان) دێنەکایەوە کەگوڵی نوێی کولتورەکەمان شکۆفە پێ دەدەن"[10]

"پرسیار: باشە بۆچی فیلمەکانت بەزمانی کوردی بەرهەم نەهێناوە؟

یەڵماز: وەرامەکەی زۆر ئاسانە..! چونکە زمانی کوردی لەتورکیادا بەپێی یاسا یاساغە"[11]

کەواتە فیلمەکانی یەڵماز، هێندە فڕیان بەسەر تورکی‌یەوە هەیە کەرێگەی بەکوردی دەرهێنانیان پێ نەدراوە. بەهرەی (یەڵمان) نموونەی هەزاران بەهرەی کپ‌کراوی لانەوازی جوامێرانی نەتەوەکەمانە. فیلمەکانی، گشت بۆن‌و تام‌و چێژێکیان کوردی‌ین، جل‌و بەرگ‌و کەل‌و پەلەکان، دیمەنەکان، سەرپاکی گۆرانی‌یەکان، هەتا گەلەك جار مۆسیقای تەسویریش سازو ئاوازی هەستهەژێنی شمشاڵی کوردین[12] بۆیە بێ‌دوودڵی، دەتوانین (یەڵمان)ی جوانەمەرگ بەرێبەرێکی هەرەدیارو درەوشاوەو رێچکەشکێنی سینەمای کوردو فیلمەکانی بەپێشەنگ‌و پێشڕەوو خونچەی تازە شکۆفەکردووی فیلمی کوردی لەقەڵەم بدەین.

بەداخەوە، وەك لەتورکیای تاواندا رێگەی بەرهەم‌هێنانی فیلمەکانی بەزمانی کوردی لێ تەنراوە، هەرچەندە نێوەرۆکی

ئەم فیلمەو زۆربەی زۆری فیلمەکانی دیکەی لەدەوری کێشە کۆمەڵایەتیو نەتەوەییەکانی میللەتەکەمان دەخولێنەوە، فیلمەکانی بەزۆربەی زمانەکانی دونیا دۆبلاژ کراون، بەڵام تائێستا تواناو دەرفەتی ئەوە نەڕەخساوە کەئەم شاکارانە بەکوردی دۆبلاژ بکرێن. منیش لەمێژە ئەم شاکارەم تەرجەمە کردووەو گفتم بەخوێنەران داوە لەفرسەتێکدا پێشکەشیان بکەم، بەڵام هەر بۆم نەلوا، هەندەك دۆستو برای ئازیزم چەند جارێك لەو بارەوە سەرکۆنەیان کردمو داوای ئەوەیات لێ کردم کەبەڵێنەکەی خۆم بەرمەسەرو چاپی بکەم. بەتایبەتو پلەی یەکەم، برای هونەرمەندو هێژام کاکە(مەهدی ئومێد) لەگشت کەس بەپەرۆشترو بەپەلەتر بوو والەژمارە (56)ی گۆڤاری رەنگینی (بەربانگ)دا، مژدەی ئەوەم خوێندەوە کەبەهیمەتی ئەوو هونەرمەندە لێهاتوەکانی هاوکاری، (یەکێتی سینەماکارانی کورد) دامەزراوە، لەگەڵ گەرمترین پیرۆزباییمو هیوای سەرکەوتنی هەمیشەییاندا، ئەم بەرهەمە خنجیلانەیەی (یەڵمان)ی بلیمەتیان پێشکەش دەکەم، بەهیوای ئەوەی ئەگەر توانا هونەریو ماددییەکە لەبار بوو، ئەوا بەڵکە بازووی مەردانەیانی لێ هەڵکەنو فیلمەکەمان بەکوردی بۆ دۆبلاژ بکەنو گیانی ڕەوانی نەحەساوەی (یەڵمان)و دڵی گشت کوردێکی پێ شاد بکەن.

**چەند سەرنجێکی پێویست لەسیناریۆکە**

وەك لای خوێنەر ئاشکرایە، من ئەم دەقەم لەئاڵەمانییەوە تەرجەمەکردووە، دەقە ئاڵەمانییەکە، راستەوخۆ لەدەقە تورکییەکەوە لەلایەن (Umit Guney)و (Norbert Ney)ەوە تەرجەمە کراوە، نازانم تا چ رادەیەك لەتەرجەمەکەیاندا سەرکەوتوون، بەڵام من هەوڵم داوە، هێندەی بشێتو بلوێت، خۆم بەتەرجەمە ئاڵەمانییەکەوە ببەستمەوەو بەهۆی جوانکارییەوە لەدەقە رەسەنەکەو مەبەستەکانی دوور نەکەومەوە و دەستپاکانە بۆ خوێنەری کوردی راگوێزم.

ئەمە بۆیە دەڵێمو بۆیە لەبریتی پێشەکی پاشەکیم بۆ نووسیوە، چونکە هەندە سەرنجێکی چکۆلەم بەرامبەر دەقەکە هەیەو نەمخواست پێش بەخوێنەر بگرمو بەر لەوەی دەقەکەی خوێندبێتەوە سەرنجی رەخنەگرانە لەهۆشیدا بڕسکێنم! وام پێ باشە کەخوێنەر خۆی دەقەکە بخوێنێتەوەو بزانێت گوتوویە چیو سەرنجی خۆی تۆمار بکاتو ئەوکاتە بێتە سەر سەرنجەکانی منو دوا بڕیاریان دەربارە بدات.

دیارە ئەگەر ئەو کەموکوڕیانەی هەستی پێ دەکرێن، لەتەرجەمەکەشەوە نەکەوتبنەوەو بەسەر خودی (یەڵمان)یشدا تێپەڕیبن، هیچ لەمەسەلەی ئەو سەرکەوتنە مەزنە کەم ناکەنەوە کە فیلمەکە بەدەستی هێناوە، بەداخەوە فیلمەکەشم لەبەردەستدا نییە تالەگەڵ دەقەکەدا بەراوردی بکەمو بزانم ئەو کەموکوڕییانە تا چ رادەیەك لەفیلمەکەدا رەنگیان داوەتەوە.

**سەرنجەکان:**

1- لەلاپەڕە (31) دا دەڵێت: (سیڤان خۆی بەدوکانێکدا دەکات.. بێریڤان هەناسە سوار لەدوویەوە دەچێتە ژووری.. چەرچییەکەش بەدوویاندا. کەچی (10) دێڕ پاش ئەوە دەڵێت: (دوکاندارەکە بەترسەوە چاوەدێری حالیلانییان دەکات کەلەپێش دوکانەکەدان. بیردەکاتەوە چۆن پاڵ بە سیڤانەوە بنێت.. لەودەمەدا چەرچییەکە دێتە ژووری...)

یەکێك لەو دوو روداوە زیادن، چەرچییەکە یا دەبێت لەگەڵ سیڤانو بێریڤاندا چووبێتە دووکانەکەوە، یاخود پاش ئەو ماوەیەی کەدوکاندارەکەو سیڤان چەند دیالۆگێکیان تێپەڕاندووە.

2- لەلاپەڕە (33)دا زنجیرەی رووداوەکان و مەودای لەقتەکان، بەشی ئەوە ناهێڵنەوە کە نێچیرەڤان بزانێت بێریڤان هیچی بەدوکتۆرەکە نەگوتووە. ئەوەتا (نێچیرەڤان) بێ ئەوەی لەگەڵدا بووبێت یا بواری قسەکردن هەبووبێت بەبێریڤان دەڵێت: (بە دوکتۆرەکەت نەگوت، بەئێمەی بڵێ).

3- لەلاپەڕە (39)دا، بروسکەی جامبازەکان دەڵێت (خۆتانو دووسەد سەر مەڕ بگەنە ئەنقەرە) کەچی لەلاپەڕە (40)دا حامۆ دەڵێت (بەڵێنی سێسەدو پەنجا سەرمان داوەو پارەکەشمان وەرگرتووەو هەر بەسەوزی خواردوومانە..! بۆیە بڕیارمان داوە پێنج سەد سەر بەرین، سەرپاکی مەڕی خێڵەکە..! جا ئەگەر ئەو سەدو پەنجا سەرە پارەیەکی چاکمان بۆ بکات ئەوا دەتوانین زستان بەسەر بەرین..تاد)

دەبایە یا دووسەد سەری بروسکەکە، یاخود سێسەدو پەنجا سەرەکەی (حامۆ) هەڵبژێردراناو ژمارەکان هاوتابانایە.

4 لەلاپەڕە (82) حامۆ بروسکەیەك بۆ حالیلانییان دەنێرێت:

(بەپەلە وەرن، لەگەڵ خوشکەکەتان بدوێن زۆر ناساغە.)

ئیمزا حامۆی ڤەیسیخانی

لەیادمە پێش چەند ساڵێك، پێم وایە لەیەکێك لەژمارەکانی رۆژنامەی (هاوکاری)دابوو، گوتارێکی رەخنەگرانەی مامۆستای چیرۆکنووسو رەخنەگر کاك (حسێن عارف)م خوێندەوە، چیرۆکی لاوێکی وەك نمونەیەکی بۆچۆنیەتی هەڵسەنگاندنی چیرۆك شی کردبووەوە، لاوەکە لەچیرۆکەکەیدا بەهەمان دەستوری (یەڵمان)ی جوانەمەرگ، بروسکەیەکی بۆ یەکێك لەپاڵەوانانی چیرۆکەکە ناردبوو، لەخوارەوە نوسیبووی (ئیمزا)! مامۆستا حسێن عارف) نووسیبووی: قەت بروسکە ئیمزا ناکرێتو تەنها نێوی لەژێردا دەنووسرێت کەزۆر راست دەکات.

خوێنەری بەڕێز- بەهیوام بەتەرجەمەی ئەم شاکارەی (یەڵمان) چێژێکم بەتۆ دابێتو خزمەتێکی گچکەشم بەکولتوری نەتەوەکەم کردبێتو بەو زوانە ئەم فیلمە کوردییە بەدۆبلاژی کوردییەوە ببینینەوە.

**کوردۆ**

**سالزبورگ- 30ی مایسی 1989**

(1) ماتیکەر لەزاراوی کرمانجی ژوروودا بەواتای ((فضولی) عەرەبیو (curious)ی ئینگلیزیو (neugierig)ی ئەڵمانی دێت.

(2) نووسەر پێشنیاز دەکات کەئەم دیالۆگو گفتوگۆانە سیمای مەسەلەو رووداوی نێوچەییان پێوەدیار بێتو لەکاتی وێنەگرتندا رێژیسیۆر دیارییان بکات. ئەم دیالۆگانەی کەلەنێوان نیشانەی (*.............*) دانراون، رێژیسیۆر خۆی ڕێکیخستوون.

(3) پێویستە دیالۆگەکانی ئەم لەقتەیە لەواقیعی ژیانی خەڵکەکەوە نێزیك بن.

(4) شوێنەکە لەکاتی وێنەگرتندا دەستنیشان دەکرێت

(5) نێوی ئەم شوێنە لەکاتی وێنەگرتندا بڕیاری لەسەر دەدرێت.

(6) (Yasilcam) شەقامێکی بەنێوبانگی ئەستەمووڵە، بەنێزیکە، زۆربەی زۆری ئەو کارخانانەی فیلمی پەڕپووت بەرهەم دێنن، لەوێن. بەرهەمەکانیان هەردەم هەمان نێوەرۆكو شێوازی دەرهێنانیان هەیە. (وەرگێڕ)

(7) گۆرانییەکی تورکیی (زولفو لیڤانەلی)یە کەدەڵێت:

"Esklya dunyaya hukumdar olmaz"

"جەردەکان ناتوانن دونیا داگیرکەن"

(8) دیارە بەپێی پەتی! (وەرگێڕ)

(9) مصاحبە بایلماز گونای مطالعات کردی، مرکز تحقیقات انستیتو کرد- پاریس- شمارە1- 1984 ص97.

(10) کوردۆ عەلی: ئەکتەرو رێژیسۆڕی کورد یەڵماز گیونی، ل24، 1984 لەبڵاوکراوەکانی رێکخراوی خوێندکارانی سۆسیالیستی کورد، شوێنی چاپی لەسەر نییە. (لەئەڵمانییەوە کراوە بەکوردی)

(11) سەرچاوەی یەکەم، هەمان لاپەڕە

(12) سەرچاوەی دووهەم، لاپەڕە 2

# پادشای ناشیرین

**وەرگێڕانی جەبار قادر**

یەڵماز گیونای یەکێکە لەهونەرمەندە هەرە بەناوبانگەکانی تورکیای شەستەکانو حەفتاکان ئەم هونەرمەندە لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی ئەکتەری سەرەکی ئەبینی لە فیلمەکانیدا لەهەمان کاتدا ڕێژسیۆر "دەرهێنەرو سینارست(نووسەری سیناریۆ)ی گەلێك لەو فیلمانەیە/ ڕۆژنامەکان نازناوی (پادشای ناشیرین)ی سینەمای تورکیایان بەم وەستایە بەخشیوە؛ بینەرانیش بەنموونەی جوانی پیاوانی دادەنێن. لەم بارەیەوە یەڵماز گیونای دەڵێ(کەلەسینەمادا دەستم کرد بەکار کردن؛ خرامە خانەی پاڵەوانە ناشیرینەکانەوە، دەرهێنەرەکانو بەرهەم هێنەرەکان کە خۆشییان بەچارەمدا نەدەهات ناچاربوون دان بەوە دابنێن کە ئەم لاوە ناشیرینە ڕۆڵەکانی لە ئەکتەرە جوانەکان باشتر ئەبینێ. با من پادشای ناشیرین بم. ڕۆژنامەکان ئەم نازناوەیان بەسەرا دابڕیم).

یەڵماز لە ساڵی 1937دا لەدێیەکی بچووك نزیك (ئەدەنەوە) هاتۆتە جیهانەوە. لەسەرەتای منداڵیەوە ئاشناو دۆستی هەژاریو نەبوونی بوو؛ لەماڵە باوکێکی جوتیاردا کە تەنیا بەجەژن گۆشتیان لەسەر مێزی نان خواردن دا دەبینرا، تەمەنی حەوت ساڵ بوو کە باوکی کوژرا؛ دوای ماوەیەکی کەم ئەوێی بەجێ هێشتو چووە ئەدەنە، لێرەدا قوتابخانەی تەواو کردو تەنیا بەکارکردنی ناوبەناو ژیانی دەبردە سەر. لەساڵی 1958 دا بوو بە خوێندکاری کۆلیجی ئابووری لە دانشتگای ئەستەمبوڵدا لەو کاتەدا چەند ڕۆڵێك لە هەندێ فیلمدا ئەبینێ وەکو (منداڵانی ئەم وڵاتە)و(لەبەرگی زەردو سوردا)1958؛ دەرهێنەری ئەم فیلمانە (عاتیف یڵمان) هەر لەو کاتەشدا بوو سیناریۆی فیلمی (گوڵی بیابان)و چەند چیرۆکێکی کورتی بڵاوکردەوە. بە تاوانی بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی چەپڕەوی، کە گوایە لە چیرۆکێکی‌دا هەبوو دووساڵ خرایە زیندانەوە. لەدواییدا بە دڵێکی پڕ لەتاسەوە دەیگوت دوو ساڵم لەزیندانا بردەسەر بەبێ ئەوەی بزانم پڕوپاگەندەی چەپ ڕەوی چی‌یە، لەو ماوەیەی لەزیندانا بردیە سەر کتێبێکی بەناوی (ئەوان بێ ئەوەی سەر دابنەوێنن)ی بڵاوکردەوە کەدەنگێکی گەورەی دایەوە. دوای بەرەڵلاکردنی دووساڵی ڕەبەقی بەبێ کاری بردە سەر. لەم بارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێ (منی برسی ئەگەڕام بەدوای کاردا.. هەرکارێك) تەنیا چارەنووسی سینەما، کە لە دەرگای ستۆدیۆی (میریچ-ی‌دا هەموو هیوای گیونای ئەوەبوو کە شوێنی کرێکارێك





لەستیۆدیۆ یا یارمەتیدەری کرێکارێکی پێ بسپێرن؛ بەڵام داوایان لەگویناى کرد کە لەفیلمی "دووپیاوی ئازا"دا ڕۆڵ ببینێ. دوای ئەم فیلمە کە سەرکەوتنێکی زۆری لای بینەران بەدەست هێنا. لەهەموو لایەکەوە داوایان لێ کرد کەلە فیلمەکانیاندا بەشداری بکات.

یەڵماز گیونای ماوەیەکی زۆر خەوی بەهەلێکی واوە دەبینی بەڵام دوای ئەوەی سەرکەوتنی وەك ئەکتەرێك بەدەست هێنا بیری لەپیشەی دەرهێنان کردەوە؛ دەستی کرد بەدەرهێنانی فیلم وەك یارمەتیدەری دەرهێنەر لەگەڵ ئەوەی بەردەوام بوو لەنووسینی سیناریۆدا، لەساڵی 1966 یەکەمین فیلم لە دەرهێنانی یەڵماز بەناوی (ئافرەتو ئەسپو چەك)ەوە کەوتە بازاڕەوە؛ دوا بەدوای ئەم فیلمە یەڵماز فیلمی (سەید خان)[3]ی دەرهێنا. لەم فیلمەدا یەڵماز ڕۆڵی سەرەکی بینیو هەر خۆشی سیناریۆکەی بۆ نووسی، لەبارەی ئەم فیلمەوە زۆر باسی یەڵماز کراوە وەکو هونەرمەندێکی زیرەكو خاوەنی بەهرەیەکی زۆر. ئەوەی شایانی باسە یەڵماز گیونایش وەکو زۆربەی هەرە زۆری هونەرمەندە پێشکەوتووخوازەکانی تری تورکیا ناچار بوو بەشداری چەندەها فیلمی بازاڕیو پایە نزم بکا بۆ ئەوەی هەندێ پارە کۆبکاتەوە بۆ دەرهێنانی فیلمێك بەدڵی خۆی؛ بەداخەوە ئەم جۆرە ڕووداوانە لەمێژووی سینەمای جیهاندا کەم نین؛ تەنانەت ڕێژسیۆری ئیتاڵی (ڤیتۆریۆدی سیکا)یش لە کارکردنیا لەم بارە دوور نەبوو. گیونای بە توانایەکی دارایی کەمەوە، بەڵام بە بەهرەیەکی هونەری بەرزەوە وێنەی پاڵەوانەکانی ئەکێشێو بەشێوەیەکی وەستایانە جیهانی ناوەوەیان دەرئەخا، ئازارەکانی مرۆڤێکی ساکار دەرئەخا بۆ بینەران کە لەبیابانێکدا ژیانی لەدەست ئەچێت بەهۆی گەڕانیدا بەدوای پارەدا کە زۆر پێویستی پێی بوو بۆ مانەوەی خۆیو خێزانەکەی). چارەنووسی کابرای عەرەبانچی چارەنووسی هەزارەهایە لەدانیشتوانی ئەم وڵاتە لەژێر سایەی کۆمەڵی بۆرژوازی پڕ لە ناکۆکیو چەوسانەوەدا.

لەهەموو فیلمەکانیدا یەڵماز گیونای چ وەك ئەکتەر چ وەك دەرهێنەر هەوڵدەدا ئەم ڕاستییە دووپات بکاتەوە.

فیلمی (هیوا) قەدەغە کرا لەلایەن ڕەقابەوە لەگەڵ ئەوەی لە دووەمین فیستڤاڵی سینەمای تورکیدا لە ساڵی 1970 بەچاکترین فیلم دانراو یەڵمازیش بەچاکترین ئەکتەری پیاوو چاکترین نووسەری سیناریۆ دانرا بەهۆی ئەوەی کە گوایە ئەم فیلمە وێنەیەکی درۆی ژیانی کۆمەڵ ئەکێشێو یەکسانی دابەشکردنی خێراتە مادییەکان بەسەر ئەندامانی کۆمەڵدا بەدرۆ ئەخاتەوە. چەندەها جار فیلمەکانی تری یەڵماز گیونای خەڵاتی نیشتمانیان پێدراوە وەکو (ناشرین)

ساڵی 1968، توورەیی ساڵی 1970، (گریان) ساڵی 1971،، فیلمی گریان لە فیستڤاڵی نێو دەوڵەتاندا لە تاران و تاشقەند لە 1974 و1976دا بەگەرمی پێوازی لێ کراو نرخێکی بەرزی پێدرا.

یەڵماز گیونای رق و کینەی هەموو کۆنەپەرستانی وولاتی بە هەموو ڕەنگ و ڕێبازەکانی‌یەوە هەڵساندو وەکو سەگی هار کەوتنە گیانی ڕێبازی سەربەخۆو بیرو باوەڕی پێشکەوتوخوازی یەڵماز گیونای کینەی بازرگانەکانی سینەمای لێ ڕاست کردەوە. پارەدارەکانی سینەما لە گیونای ئەترسن و ئەیانەوێ بەهەموو شێوەیەك لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکان ناوی ڕەش کەن، بەلاّم فیلمە پڕ ماناکانی ئەم هونەرمەندە ڕێزلێنان و بەرز نرخاندنی هەموو مرۆڤە بە ویژدانەکانی ئەم وولاتەی پەیداکرد؛ یەکێك لە هاوەڵەکانی دەڵێ ئەو سەرمایەدارەکانی سینەمای تێکشکان لە یاریەکەی خۆیاندا؛ ئەوان پێویستیان بە فیلمەکانی هەیە چونکە بینەران حەزی لێ ئەکەن ئەگەر بێت و فیلمەکانی لە ڕەقابە تێپەڕن ئەوا سەرکەوتنیان مسۆگەرە.

پارەدارەکان لەخوایان ئەوێ گیونای خۆی ببەستێ بەسیستەمەکەی ئەوانەوە بەلاّم ئەو نایەوێ. بەلاّم بەداخەوە هاوبیرو هاوەڵی ڕاستەقینەی گیونای کەمن. دوای کۆدەتای سەربازی لە حەفتاکاندا باری سەربازی بەسەرا فەرز کراو دەست کرا بەڕاپۆرت نووسین، موراقەبەکردن و گومان لێکردنی کاری ئاسایی بوون لە وولاتدا؛ لێرەدا گیونای بەشی وابوو دوای ماوەیەکی کەم خرایە ئەودیو شیشی ئاسنی پەنجەرەی زیندانەوە. ئەمجارەیان ئەوەی بۆ دروست کرا کە گوایە جێگای ئەنارشیستەکانی (فوضوی) کردووەتەوە بۆ ئەوەی خۆیان بشارنەوە ڕۆژنامە دواکەوتووەکان هەناسەی پشوویان هەڵئەکێشاو تەوسیان بە (پاشای ناشرین) ئەکرد کە نەك تەنیا کارکردن، بەڵکو لەسەر بەستیش بێ بەشکراوە . لەساڵی هونەرمەندە بەناوبانگەکانی جیهان وەکو ریچارد بیر ئێلیزابیت تایلەر (میلینا میر کوری) و (پیەتەر بڕۆك) و (ریچارد سون) و گەلێکی تر ناڕەزایی خۆیان لە گرتنی یەڵماز گیونای دەربڕی و داوای سەرفرازکردنیان کرد. گیونای لە زیندان هەواڵی پێگەیشت کە فیستڤاڵی سینەمای تورکیا لە ساڵی 1972دا لە ئەنتاکیە فیلمی (باوك)ی بە چاکترین فیلم دانا، خۆیشی بەباشترین ئەکتەر دانراوە، کاربەدەستانی وڵات ئەو بڕیارەیان بەدڵ نەبوو، لیژنەی سەرپەرشتی فیستڤاڵەکەی ناچار کرد کە چاو بەبڕیارەکەدا بگێڕێتەوە. لەدواییدا بڕیاریاندا کە خەلاّتەکە بدرێتە دەرهێنەرێکی تر بەلاّم ئەو دەرهێنەرەی تر قایل نەبوو کەئەم خەلاّتە وەربگرێ زۆر ناڕەزا بوو لەو هەڵوێستەی لیژنەکە ئابەم شێوەیە یەڵماز گیونای کە لەسەربەستی بێ بەش بوو خرابووە زیندانەوە؛ بەلاّم هەر بەسەرکەوتوو ئەزانرا، لەماوەی دوو ساڵ و نیوی ڕەبەق بەناوبانگترین وەستای سینەمای تورکیا ئاسمانی تەنها لە شیشەکانی پەنجەرەی زیندانەوە ئەبینی.

لە ساڵی 1974دا دوای ئەوەی ئازادکرا بەڕۆژنامە نووسێکی ووت: (ژیانی زیندانیم بەشێکە لە خەباتی کۆمەلاّیەتیم) ئێستاش ئەرکی سەر شانم دروست کردنی فیلمی تازەیە جارێکی تر یەڵماز هاتە مەیدانی فیلم دەرکردنەوەو لە ماوەیەکی کەمدا دوو فیلمی بەبەرهەم هێنا (هەڤاڵ) و (ئەندێشە) فیلمی دووەم بەهۆی گرتنی گیونایەوە جارێکی تر لەلایەن هاوەڵەکانیەوە تەواو کرا. یەڵماز نووسەری سیناریۆو دەرهێنەری فیلمی یەکەم بوو هەروەها ڕۆڵی سەرەکی تێدا بینیبوو. ئەم فیلمە باسی دوو هاوەڵی سەردەمی خوێندنی خوێندنگامان بۆ ئەکا کەدوای لێك جیابوونەوەیان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەیەك ئەگەنەوە.

(ئەزیم) یەڵماز گیونای، و(جەمیل) کەریم فشار، لەکاتی خوێندندا لەیەك جیا نەئەبوونەوە بەلاّم لەدواییدا بەهۆی شێوازی ڕێگەی ژیانیان لەیەك جیابوونەوەو جەمیل بوو بە خاوەن سامانێکی سەرکەوتوو. ئەزیم زۆری پێناخۆشە کە هاوەڵەکەی ئەبینێ تەنیا بیر لەبەرژەوەندی خۆی ئەکاتەوە. ئەزیم تێئەکۆشێ لەپێناوی جەمیلی مرۆڤداو بەهەموو شێوەیەك هەوڵ ئەدا جەمیل لەوە بگات کە مرۆڤ ئەبێ لەپێناوی میللەتا بژی؛ بەلاّم هەموو هەوڵ و تەقەلای ئەزیم بەفیڕۆ ئەچێ. هەڵوێستی ژنەکەی جەمیل کە بەبێ ئارامی‌یەوە ئەڕوانێتە پێکردنی (خراپی) هاوەڵی کۆنی مێردەکەی و پەیوەندی ئەزیم و ژنی هاوەڵەکەی ئەگاتە ئەوەی کە ژنەکە دەست لە ئەزیم بەرزئەکاتەوەو پڕ بەتوانای خۆی ئەکێشێ بەڕوویا لەم کاتەدا دەنگی تەقە دێ کە ئەوە ئەگەیەنێ کە برادەری ئەم دووهاوەڵە بێ دێ و ڕێگای ژیانیان بۆ هەمیشە جیا ئەبێتەوە، بەم شێوەیە بە دوو هەڵوێستی ئەخلاقی (ئاکاری بەرامبەر بەیەك ئەوەستن): یەکەمیان مرۆڤانەیەو لەبەر ئەوە نەمرە: دووەمیان کاتی، یەڵماز لە (هەڤاڵ)دا ئەو بیرو باوەڕە دووپات دەکاتەوە کە مایەی ژیان خزمەت کردنی خەڵك ئەگەیەنێ، فیلمی (هەڤاڵ) لەناو کۆمەلاّنی خەڵکدا دەنگی دایەوەو زۆرترین ژمارەی بینەرانی کۆکردەوە لەمێژووی سینەمای تورکیادا؛ لەماوەی دوو مانگی ڕەبەقدا ئەم فیلمە لە سینەماکاندا پیشان ئەدرا کە جمەیان ئەهات لە خەڵکا کەشتی وا لە تورکیادا ڕوی نەداوە ڕۆژنامەکان نرخێکی بەرزیان بۆ ئەم فیلمە دانا مەترسی کۆنەپەرستەکان لەدەنگ دانەوەو ناوو ناوبانگ دەرکردنی گیونای ناچاری کردن جارێکی تر لەو دیوی دەرگای بەندیخانەوە توندی بکەن. ئەم جارەیان تاوانی پیاوکوشتنیان بۆ دروست کرد. لەو کاتەی کە یەڵماز خەریکی فیلمی (ئەندێشە) بوو لە ئەدەنە (موددەعی ئەم شارە کوژرا) لەبەرئەمە دوژمنانی یەڵماز ئەمەیان بەهەل زانی بۆ تاوانبارکرنی نووسینی سیناریۆی ئەم فیلمەو دەرهێنانی هەر خۆی بوو.

ئەم فیلمە بەووشەکانی خۆی دەربارەی (چاوەڕوانی هەمیشەیی و هیواو بێئارامی مرۆڤی کرێکارە) فیلمی (هەڤاڵ) لەکێشەکانی خوێنەواری تورکیا دەدوێ بەلاّم "ئەندێشە" باسی ژیانی جوتیاران ئەکات: پاڵەوانی فیلمە کە جەبار" ئەکتەر ئەرکان یۆرجی" ڕۆڵی بینیوە کە بوو بە خۆبەخت کەری یاسای خوێن سەندنەوە بەگوێرەی نەریتەکانی دێ و هۆز ئەبێ ژیانی خۆی لە دوژمنەکانی بکڕێتەوەو خوێنانەیان بداتێ ئەگینا مردن چاوەڕوانی ئەبێت.

لەوەرزی لۆکەدا بەشەو بەرۆژ ئەکەوێتە کار کردنەوە؛ تەنانەت ئەو کاتەش کە هاوەڵە کرێکارەکانی مان ئەگرن بۆ بەرز کردنەوەی کرێ یان ئەم لەکارکردنی خۆی ناکەوێ چونکە ئەم کاتی ئەوەی نییە بەهیوای ئەوەی بتوانێ پارەی پێویست کۆ بکاتەوە بۆ کرینەوەی ژیانی بەڵام لەگەڵ هەوڵو تێکۆشانیا ئەم هیوایەی نایەتە دی. کچەکەی کەبەتەمای بوو شیربایییەکی باشی بۆ بکات لەماڵ هەڵ دێو پارەی کرینەوەی ژیان کۆنابێتەوەو بەدەستی دوژمن ئەکوژرێت.. لەسەرە مەرگدا داوای لێبوردن لەهاوەڵەکانی دەکا؛ بەڵام ئەوانیش نەهەستی پێ ئەکەنو نەهەوڵ ئەدەن تێی بگەن.

رەخنەگری سینەما "ئێندەر کامیل بۆیەچی" ئەڵێ : "ئەگەر بێتو یەڵماز گیونای فیلمێکی تر دەربارەی ژیانی کرێکارە پیشەسازەکان دەرکا ئەوا ئەو فیلمە لەگەڵ "هەڤاڵ" و ئەندێشەدا" ئەبێت بە زنجیرەیەکی سێ بینە کە کێشەکانی کۆمەڵی هاوچەرخی تورکیامان بۆ روون دەکاتەوە. لەم کاتەدا یەڵماز بیری لەفیلمێکی ئاوا ئەکردەوەو خەریکی خۆ ئامادە کردنبوو بۆ بەدی هێنانی. گەلی ٭ پرۆژەی بۆ ساڵی 1975 ئامادەکردبوو وەك دەرکردنی سێ فیلمو رۆڵ بینین لە شەش فیلمدا؛ بەڵام چینە دواکەوتووەکان پرۆژەی تریان بۆ ئامادە کردبوو، ئەویش ئەوەبوو کەسەر لەنوێ خرایە بەندیخانەوە، ئامانجیان لە گرتنی وەستای پر لەبەهرەی سینەمای تورکیا ئەوەبوو کە بێ دەنگی کەن بەڵام بەهەڵە داچوون، ناوی یەڵماز گیونایو وێنەکانی لەکاتی زیندان کردنیدا هەمیشە لەسەر لاپەرەی رۆژنامەو گۆڤارەکان لانەدەچوو؛ گەورەترین سینەماکانی ئەستەمبولو سامسۆنگو ئەزمیر هەفتەی پیشاندانی فیلمەکانیان ساز ئەکردو هەموو فیلمەکانی پیشان ئەدرا؛ تەنانەت بەبۆنەی گرتنیەوەو وەستانی لە بەردەم دادگادا چەند کتێبێك بڵاوکرایەوە وەکو کتێبەکانی "ئەپۆس گیوچ" بۆچی یەڵماز گیونای ؟ و "ئەلتان یان چین" دۆسیەی یەڵماز گیونایو ئەبەرداکچی "مەسەلەی یەڵماز گیونای" لە نیسانی ساڵی 1977 لەکاتی فیستڤاڵی جیهانی سینەمادا لە سان ریمۆ لەگەڵ سەرکەوتنێکی زۆردا هەفتەی فیلمەکانی یەڵماز گیونای سازکرا. باشترین فیلمەکانی خرایە \پرۆگرامی هەفتەکەوە وەکو هیواو هەڤاڵو ئەندێشە.

) چاکترین فیلمەکانی یەڵماز گیونای ئەمانەن:- (لەبەرگی زەردو سوردا–1959، گوڵی بیابان–1961، تەنیا یەك جار بەرەو مردن ئەڕۆی–1962، دارەکان بەپێوە ئەمرن–1964، یاسای سنوورەکان -1966، –1967، پیاو کوژی خۆ بەخت کەر–1968، ناوم کەریمە–1967، پیاوێکی ناشیرین–1968، سەید خان–1968، گورگە برسیەکان–1969، ئەمەوێ لەگەڵ تۆدا بمرم -1969، ئامانجی زیندو–1970، هیوا–1970، تووڕەیی–1970، بێئومێدان–1971، سبەینێ دوا رۆژە -1970، باوك–1971، گریان–1971، وێنەی ناو ئاو–1972، ئەندێشە–1975، هەڤاڵ–1975، رۆژێ دێ هەروەها فیلمی (یۆل)و ..تاد..

) فیلمی سەید خان لەساڵی 1968 لە فیستڤاڵی سینەمای تورکیدا لەئەدەنە پلەی سێیەمی پێدراو یەڵماز وەك باشترین ئەکتەری پیاو خەڵات کرا.

) ئەرکان یۆجیل لە فیستڤاڵی 1977دا لە سان رینۆ بۆ ئەم رۆڵەی بەباشترین ئەکتەری پیاو دانرا.نووسەر کتێبەکەی لەساڵی 1978دا بڵاوکردەوە کە هێشتا یەڵماز لەبەندیخانەدا بوو هەر وەك حوسێنێۆف لەو باوەڕەدابوو کە یەڵماز جارێکی تر سەرنجی خەڵك بەرەو خۆی رادەکێشێو بینەران دڵ خۆش ئەکا ئەم باوەڕە لەجێی خۆیدابوو ئەوەبوو فیلمی "یۆڵ" واتە رێگا ئەو دەنگەی دایەوە لەسەرانسەری جیهانداو لەرۆژنامەو گۆڤارەکانی لای خۆمانیش چەند جارێك شتی دەربارە بڵاوکرایەوە.



**سەرچاوە / کاروان ژمارە (28) کانوونی دووەم ساڵی 1985.**

**پەراوێزەکان :**

) ئەم ووتارە بەشێکە لە کتێبی رۆژهەڵات ناسی سۆڤیەت (ئە.. ئە ..حوسەینۆڤ) سینەمای تورکی مێژوو کێشە هاوچەرخەکانی ، مۆسکۆ 1978ل. 112–118 بەزمانی رووسی.

# له جه‌ژنی نه‌ورۆزدا *

**هه‌ڤالێن منێن هێژا،**

**هۆگرین من،**

**ومێڤانێن هێژا**

**هون ب خێرهاتنه، سلاڤ ل وه‌...**

وه‌کی هون دزانن، نه‌ورۆز ژ بۆ گه‌لێ کورد نیشانا به‌رخودانا دژی زالمان و زۆر ده‌ستییێ، دژی دلساری و ته‌سلیبیه‌تێ، نیشانا شه‌ڕێ ئازادی و سه‌رخۆ بوونێ، نیشانا یه‌کیتی و هه‌ڤگرتنێیه‌.

ئه‌ز دزانم کو دلێن هه‌ڤالێن کو ئیرو ل ڤێ ده‌رێ سڤیانه ب ته‌ڤایی ب ڤان هسان لێ دخه‌. ئه‌وێ دلا زارۆکێن مه ژێ بۆ ڤان هسان لێنه‌. ژبۆ ئازادی و سه‌رخۆبوونێ، ژبۆ کو به‌لاڤبوونێ ڤاگه‌رنین یه‌کێتیێ...

هه‌یا ئیرۆ دبه‌ر ڤان ئامانجان ده گه‌له‌ك گۆڕی هاتن داین، وێ هێ ژبێن داین. ژ به‌رکو بێ گۆڕی سه‌رکه‌تن نه‌ممکنه‌. دڤێ کو ئه‌م خوێن و هێسران بدین به‌ر چاڤان. ئه‌م دپرسین: گه‌لۆ که‌س دکاره ده‌نگێ دله‌کێ ته‌ژی تله‌زم و ئنیات. ته‌ژی باوه‌ڕی ببره؟ ئه‌م دپرسین: گه‌لۆ ممکنه کو سه‌رێ گه‌له‌کی ئه‌ڤ قاس ب قه‌رار، ئه‌ڤ قاس مێرخاس و فه‌داکار بێ ته‌واندن؟

توجار.. گه‌لی هه‌ڤالان، جه‌فا سته‌م، به‌له‌نگازی، خوێن و هێسرێن چاڤان قه‌ده‌ر گه‌لی کوردینه‌. ئه‌م ڤێ قه‌ده‌رێ ڕه‌د دکن، ئه‌م ڤێ قه‌ده‌رێ ناس ناکن. ئه‌م ناخوازن کو زارۆکێن ولاته‌کی ژچار ئالی ده ئیشغال کری مسته‌ملیکه بمێنن، دخوازن ل ولاتێ خۆ، له‌سه‌ر ئاخۆ، ب زمانێ خو، سترانێت ئه‌ڤین و ئازادێێ بسترێن.

ئه‌م دخوازن دنیا خۆ ب ده‌ستێن خۆ ئاڤاکن. ئاخا خۆ ب ده‌سێن خۆ بکار بینن، ته‌شه‌ێن نوو برین وانۆ ئه‌م دخوازین له سه‌ر ئاخا خۆ دبین ئالا خۆ ده‌سه‌ربه‌ست و سه‌ربه‌خۆ بژین. ئه‌م دیسا ژ بیرناکن کو مه‌نفه‌عه‌تا کارکه‌ر، گوندی و خه‌باتکارێن کورد، تورك، عه‌ره‌ب و عه‌جه‌م و ئاڤا کرنا ده‌وله‌تێن یه‌کبوویی و خورت ده‌یه‌. لێ یه‌کیتیه‌ك وه‌ها ب پێکانینا هۆین (شه‌رتێن) ممکنه‌، هه‌که ئه‌ڤ تونه‌به‌، ئه‌ڤ یه‌کیتی خه‌ونه‌. ژ ڤێ بوونی ل پێشیانمه ب ته‌نێ رێیه‌ك هه‌یه:

هم له ناڤ خۆ و هم ل ده‌رڤایێ خۆ تێکۆشینه‌ك پرالی...

گه‌لی هه‌ڤالان، ئامانجێ که‌سێن کو ئیرۆ ل گه‌له‌ك هێلێن کوردستانێ، ل سه‌رێ چیان، ل ده‌شتان دزندانێن فاشیزمێ ده ل دژی سته‌م و زولمێ شه‌ڕ دکن، تێن کوشتن، ژ هه‌ر ئه‌ڤه‌. برانینا وانێت کو دشه‌ڕ هاتن کوشتن، کو دڤێ رێێ ده شه‌هید که‌تن، د دلێ خۆده‌و نێکۆشانا خۆده، خۆدی بکه‌ن بدن ژیاندن. خوزێ به‌وانێت کو ب به‌رخدان مردن، و بوون ئاگرێ مه‌شخه‌لا سه‌رخۆبوون و ئازادیێ. پڕ خۆزی ب وان!...

هه‌ڤالێن هێژا، تێ بیراوه‌، دجه‌ژنا کو ژبۆ ڤه‌بوونا ئه‌نستیتویا کوردی هاتبوو چێ کردن، من ئاوا گوتێ بوو: ئه‌نستیتۆیا کوردی نه‌دی خزمه‌تا فلان ئان بێڤان گروبێ ده‌یه‌. ئه‌نیستۆتو مه‌لبه‌نده‌که‌



زانستیا کو ده‌خزمه‌تا ته‌مامیا نه‌ته‌وه‌یێ کورد ده‌یه‌. خه‌بات و ئیجرائێتا ساله‌کێ، ئه‌ز باوه‌ڕم، ڤان گوتێن من راست ده‌رخستن. بلا هه‌رکه‌س باشه زانیببه کو ئه‌وێ ئه‌نیستیتو کاره‌کته‌رێ خۆی سه‌ربه‌خۆ. بێئالی، ئاڤاهیا خۆ یا ده‌موکراتیك دسه‌ر هه‌ر تشتی ده بگره‌و بپارێزه‌ز ئه‌وێ توجار نه‌که‌ڤه دافیکا پۆله‌میك و خره‌جرێن سیاسییێن سته‌ور. دڤێ کو هون ژ ئه‌نیستیتویا وه‌یا وه‌کا چاڤی خۆ بپارێزن و پشتیڤانیا تێکۆشانا وێ بکن.

هه‌ڤالین من، ئه‌نیستیتو شتله‌ك تۆڤێ سه‌رخۆ بوونێیه‌و به‌رهه‌ما تێکۆشانا کو نه‌ته‌وه‌یی کورد هه‌یا ئیرۆدایه‌یه‌. پێشه‌ڤه‌چوون و خورت بوونا وی ب خه‌بات و هاڤکاریا وێ ڤه‌گرێداییه‌. ئه‌مێ ل دۆرا ئه‌نیستیتویێ بچڤین و ل کارینا خۆ ئالیکاریا وه‌زیفێن کو وێ دانییه پێشیا خۆبکن. ئه‌مێ زانین کو شرێ سه‌ربه‌خۆبونێ ته‌ڤاهیه‌که‌. جارنا نڤیساندنه‌که دا رێز کو ڕاستی ئیتاده دکه‌، ڕامانه‌ك، جارنا ڤیرنا سترانه‌ك کو ددلا حه‌لکێ ده ده‌نگ دده‌. جارنا مزاربه‌ك کو ل تێلا وارێن ژیانێده

شه‌ڕکارێن باشه‌. شه‌ڕکارێن ژێهاتی بن و دڤێ کو ئه‌م شه‌رکارێن وه‌ها بگینن.

دڤێ کو ئه‌م باش، پڕ باش لێ ته‌نبوورا خۆ خن؛ دڤێ کو ئه‌م خۆش، پڕخۆش سترانا بیسرێن. دڤێ کو ئه‌م وێنه‌ێن باش، پڕ باش چێکن. دڤێ کو ئه‌م چیرۆکێن باش، هه‌لبه‌ستێن باش، رۆمانێن، خورت بنڤیسنن. دڤێ کو ئه‌م دپلومات و یه‌ك ئینسانێن خورت بگهێنن.

دڤێ کو ده‌ستێ مه هه‌م باش قه‌لـه‌مێ، هه‌م ماکینێ، هه‌م ژ چه‌کێ (سیلاحێ) بگره‌. دڤێ کو جارنا ته‌نبوورا مه ببه‌چه‌ك جارنا چه‌کێ مه ببمه ته‌نبوور–دیسان ئه‌م باش دزانن کویێ کو سترانێن، گوتنێن ڕاسترین دبێژه گوله یا کو دجێێ خۆ هاتیه بکار هانین.

هه‌ڤالنۆ، چیاێن مه‌، ده‌شت و چه‌مێن مه‌، ل هێڤیامه‌نه‌. ئه‌م ناخوازن ئه‌مرێ خۆ ته‌ڤلێ غه‌ریبیا کن و سترانێت غه‌ریبیا بێژن. ئه‌م خه‌لکه‌کی وسانن کو ب مێرخاسیا خۆ ده‌ستانان نڤیساندیه‌و ئه‌زم، ب قه‌رارێ و خوێن مه تێردمن و کوب سه‌ر دژوارییێن پاشیامه که‌ڤین.

شۆڕشگێڕێن دیموکراتێن ترك، عه‌جه‌م و عه‌ره‌ب وه‌کی پاراستگه‌رێن مافی گه‌لێ کوردێ ب خۆ تاڤین کرنا قه‌ده‌را خۆ په‌رچه‌یه‌ك ڤی شه‌ڕینه‌و شه‌ڕێ دژمنێ مشته‌ره‌ك دکن.

براتیا چینی یا چینه‌ن بنده‌ست یه‌ك ژ خۆرترین چه‌کێ مه‌یه‌.

بلا دۆست و دژمن، هه‌ر که‌س زانبه کو ئه‌مێ ب شه‌رکه‌ڤن، محه‌قه‌ق ب سه‌رکه‌ڤن. وه‌کی شه‌ڕ که‌ره‌کی ئازادێی مرن ژ وه‌کی کۆله ژیندنێ چێتره‌.

**بژی کوردستانا سه‌ربه‌خۆ، یه‌کبوویی، دیموکراتیك!**

**بژی براتی و پشتیڤانیا گه‌لێن ترك، کورد، عه‌جه‌م و عه‌ره‌ب!**

**و بژی ئه‌نیستیتویا کوردی.**

************************************

*یه‌لماز گۆنای ڤێ گوتارێ 18 ئادار 1984 د جه‌ژنا نه‌وروزا کو ئه‌نیستیتویا کوردی ل پاریسێ چێ کردبوو ل به‌ر دوو هه‌زار میڤانان ب زمانێ ترکی گۆت. یلماز دیتنێن خۆێن ل سه‌ر زرگاریا گه‌لێ توجار ب زه‌لالی و خورتاهیێ نه‌گۆتبوو. گه‌لۆ ژ ره چێ ببوو کو نه‌ڤ کارا داوینه کو ئه‌و ل هافا گه‌لێ خۆ دپه‌یڤ؟ گلی و شیره‌اێن یی گوتارێ فێرێن ژیانه‌که ده‌وله‌مه‌ند، به‌رهه‌مێن جێربانـدن و ڕامانێن سالارنن. گۆتار وه‌سیه‌ت نامه‌یه‌که ژ بۆ ولات پارێزن کورد، ژ بۆ جانیا کوردستانێ، ژ بۆ نه‌وشێن نووێن ڕۆژهه‌لاتا ڤین.